# سۆزی نەتەوایەتی

# و

## بیری ناسیۆنالیزم

## لە تەرازووی ئیسلام دا

نووسینی:

**عەلی باپیر**



چاپی دووەم
١٤١٩ك - ١٩٩٨ز
سلێمانی

# سۆزی نەتەوایەتی

و

# بیری ناسیۆنالیزم

## لە تەرازووی ئیسلام دا



نووسینی:

عەلی باپیر

چاپی دووەم

١٤١٩ك ـ ١٩٩٨ز

سلێمانی

# پێشکەش بێ

١- بە گیانی بێداری سەلاحەددینی ئەیوبی،

کە هێندە سەرکردەیەکی مسوڵمانی دادگەرو بەجەرگ و بەخشندەو ڕەوشت بەرز بوو، تەنانەت دوژمنانیشی دانیان بەگەورەیی‌دا هێناوەو پێیان هەڵگوتوە.

٢- بەگیانی بێگەردی سەعیدی نوڕسی،

ئەو زانا خواناس و تێکۆشەرو نەبەزەی کە بەتەنێ بەرەنگاری ڕژێمی ڕەگەزپەرست و عەلمانیی تورکیا بوو، وە زۆربەی تەمەنی خۆی بەدوورخراوەیی‌و گیراویی‌و دەست بەسەری بەڕێ کرد لەپێناوی خودا.

٣- بەو مسوڵمانانەی

کە بێجگە لەخوا بەهیچ پەرستراوو بێجگە لە پێغەمبەری خوا (محمدﷺ) بەهیچ ڕابەرو، بێجگە لەئیسلام بەهیچ بەرنامەی دیکە ڕازی نین.

٤- بەو ئیسلامی‌یە ڕەسەن و تێگەیشتووانەی

کە هەست و نەستی نەتەوایەتی‌و نیشتیمان پەروەری بە بەشێک لە مسوڵمانەتی‌یەکەیان دەزانن و ڕزگار کردنی گەلی چەوساوەو ئازادکردنی خاکی زەوتکراویان بەئەرکی سەرشانیان دادەنێن.

# پێشەكيى چاپى دووەم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله ومن اهتدى بهديه...

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەويستەكانم!

ئێستا كە بۆ جارى دووەم ئەم كتێبە (سۆزى نەتەوايەتى) چاپ دەكرێتەوەو ساڵانێكى دوورو درێژ بەسەر نووسين و چاپ كردنيدا ڕابردوون، بێگومان دەربارەى مەسەلەو بابەتە گرنگ و جۆراو جۆرەكانى نەتەوايەتىو كوردايەتى قسەو تێبينىو سەرنجم زۆرن كە دەبوايە لەم پێشەكىيەدا ئاماژەيان بۆ بكەم، بەلاّم لەسۆنگەى ئەوەوە كە هەموو ئەو مەسەلانەم بەگوشراوى لەبەشێكى تازەو سەربەخۆى ئەم كتێبەدا نووسيون كەبەشى چوارەمە بەناوى: (مسوڵمانەتىو كوردايەتى لەڕوانگەى ئيسلامىو عەلمانىيەكانەوە) بۆيە لێرەدا بەپێويستى نازانم هيچ بڵێم، جگە لەئاماژە كردن بەڕاستىيەكى يەكجار گرنگ ئەويش ئەمەيە كە:

بەدرێژايى مێژووى مرۆڤ لەسەر زەوى دەرك كردن و پەى پێ بردنى هەق چەندە گرنگ بووە بۆ ئينسانەكان، پابەندىو ڕەفتار پێ كردنيشى هێندەو بگرە پتريش، واتە مەسەلە هەر ئەوە نەبووە كە ئينسان هەق بدۆزێتەوەو پێى ئاشنا بێت، بەڵكو پابەندى بەهەقەوەو وەرگرتن و كار پێ كردنيشى هێندەو بگرە گرنگتريش بووە.

جا لەمەسەلەى ديندارىو كوردايەتى كردنيشدا بەهەمان شێوە: ئەسڵى پەى بردن بەئيسلام و تێگەيشتنى، ئاشنابوون بە حەقيقەتى كوردايەتىو شارەزابوونى چەندە گرنگ و كاريگەر بوو ون، خودى (ديندارى كردن) و (كوردايەتى كردن)ە كەش هێندەو بگرە زياتريش، چونكە زۆر بوون و زۆرن ئەوانەى بەڕواڵەت خۆيان بەمسوڵمان و كوردێكى ڕەسەن دەزانن و زۆريش دەتوانن لەبارەى ئيسلام و كوردايەتىيەوە بدوێن و بنووسن، بەلاّم كە تەماشاى پەرێزو كردارو واقيعى ژيانيان دەكەى زۆر بەزەيبيت بە ئيسلامەتىو كوردايەتىيەكدا دێتەوە كە ئەو جۆرە كەسانە نوێنەرايەتىيان دەكەن!

بە كورتى مەسەلە هەر (زانين) نيە، بەڵكو (توانين)يشەو با هەموومان هەوڵ بدەين وە جەخت لەخۆمان بكەين كە چ لەبوارى ئيسلامەتىو ديندارى داو چ لەبوارى كوردايەتىو نيشتيمان

پەروەریدا -کە بێگومان کوردایەتی ڕاست و شەرعی بۆ بابایەکی مسوڵمانی کورد هەر بەشێکە لەدینداری‌یەکەیشی- قسەو کردارو هەست و نەست و هەڵوێستمان یەك بن وە لەیەك جیاو دژ بەیەك نەبن، چونکە کورد بەو جۆرە کەسانە دەڵێن: (وەستای قسان و کۆڵەواری دەستان)و بە دووڕوو و دەغەڵیان دادەنێن و ، خوای پەروەردگاریش ئەو خەسڵەتە بەدە بەمایەی تووڕەیی‌و خەشمی خۆی دادەنێ‌و لەو بارەوە فەرموویەتی ﴿یاءَیها الذینَ آمنوا لِمَ تَقُولون ما لاتَفعلون. کَبُرَ مَقتاً عند الله أن تَقولوا مالاتَفعَلون﴾ الصف (٢-٣).

وەمن دڵنیاشم هەر مسوڵمانێکی کورد باش لە ئیسلام حاڵی بووبێت و دڵسۆزیش بێت حەتمەن بۆ گەل و نیشتیمانەکەیشی وەفادارو بەمشوور دەبێت، چونکە دەزانێ کە (خێر بەخوێش نەك بە دەروێش) و، دەشزانێ کە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی بەندایەتی‌و مسوڵمانەتی کردنەکەی پێویستی بە خەڵکێکی ڕزگارو خاکێکی ئازاد هەیە، دینداری نەلەئاسمانی‌و نەلەبن زەوی‌دا ناکرێ‌و حەتمەن دەبێ لەنێو خەڵك و لەسەر خاکێك بیکات و نزیکترین و گونجاوترین خەڵك و خاکیش ئەو خەڵك و خاکەیە کەتێیان دا ژیاوەو پێگەیشتوە.

هەروەها دڵنیاشم کە هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆ گەل و نیشتیمانەکەی، حەتمەن ئەگەر گریمان بڕواشی بەئیسلام نەبێ وەك ئایین و بەرنامەی ژیان و گوزەرانی، بەلام ڕێزو حورمەتی دەگرێ‌و دژایەتی‌و بێ‌ئەدەبی بەرانبەر ناکات، چونکە دەزانێ کەگەل و میللەتی بێ ئایین و عەقیدە -بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئایین و عەقیدەیەش ئیسلام بێت- وەك جەستەی بێ‌گیان وایەو بۆ خۆی سەربەخۆ بەرەو داڕزان و گەندەڵی دەچێ‌و بۆی دەردەچێ!

ئیدی هیوادارم هەموو لایەکمان مسوڵمانەتی‌و کوردایەتی‌یەکەمان ناوو نێوەرۆکیان یەك بێ‌و هەرکامێکیان مسوڵمانێکی ڕاستەقینە یان بەلای کەمەوە کوردێکی دڵسۆزو ڕەسەن بێت.

١٠ ی (محرم) ی ١٤١٩

٦ ی (ئایار) ی ١٩٩٨

هەولێر

# پێشەکیی چاپی یەکەم

سوپاس بۆ ئەو خوا کاربەجێیەی کە باب و دایکی مرۆڤانی لەخاك و ئاوی سەر زەوی خولقاندوون و، دوایی بەمەبەستی بەرەو پێش چوونی ئینسان و بەپێزبوونی ژیانی بۆ چەند تیرەو گەلێك دابەشی کردوون.

وەسڵاوو ڕێزو ئاشتی خوا بەسەر گیانی بێ خەوشی ئەو پێشەوا بەڕێزەماندا بڕژێ، کەلە ژیانیدا عارەب و عەجەم و ڕەش و سپیو دەوڵەمەندو نەداری وەکو یەك سەیر کردوون.

خوێنەری بەڕێز!

لەڕاستیدا سەرەتای پەیدابوونی خۆشویستنی گەل و نیشتیمان لەژیانی ئینساندا، بریتییە لەسەرەتای نیشتەجێ بوونی لەسەر خڕۆکەی زەوی، چونکە هەبوونی سۆز لەدڵ و دەروونی مرۆڤدا سەبارەت بە نەتەوەو هۆزو خاك و ئاوەکەی یەکێکە لەغەریزە بنەڕەتیو ڕەسەنەکانی سروشتی.

بەڵێ! لەوەتی مرۆڤ لەسەر زەوی دەژی، خاك و ئاوو نیشتیمانێك کە تێیدا پێگەیوەو، تیرەو گەلێك کە خووی پێوە گرتوون و ژیانی لەگەڵ بەسەر بردوون و تەمەنی لەگەڵ بەڕێ کردوون، جێی سۆزو خۆشەویستیو ڕێزی بووون.

بەلأم ئەو هەست و سۆزە سادەو سروشتییە وەك هەموو غەریزەیەکی دیکەی سروشتی مرۆڤ، لەکاتێکدا زیادە ڕۆیی تێدا دەکرێو لەچۆنیەتیو چەندیەتییەکەی زیاد دەکرێ، شێوەو بیچمە سادەو سروشتییەکەی خۆی بەردەداو، ڕەنگ و دیمەنێکی دیکەی ناقۆڵاو نەگونجاو بەخۆوە دەگرێو، لەگرێ ژەنە دەچێو لەبەرچاوان بەد دەبێ.

جا بۆیە بەدرێژایی مێژوو لەئاقار ئەو غەریزە سادەو سروشتییەدا، کەدەتوانین پێی بڵێین (سۆزی نەتەوایەتیو نیشتیمان پەروەری) شتێکی دیکەش هەبووە کە هەرچەندە لەبنەڕەت و سروشتدا سەرچاوەیەکیان هەیە، بەلأم لەشێوازو چەندیەتیو چۆنیەتیدا هێندەی زەویو ئاسمان لێك دوورن، ئەویش بریتییە لە (نەتەوەپەرستیو نیشتیمان پەرستی) یان (ناسیۆنالیزم)، بەلأم بیری ناسیۆنالیزم -هەرچەندە بەشێوەیەکی سادە لەمێژە هەیە- زۆر نیە وەك فەلسەفەو بیرو باوەڕێك سەری هەڵداوە، بەڵکو لەڕاستیدا کاتی لەدایك بوونی دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕشی فەرەنسا (١٧٨٩ز)[1].

---

(١) تاریخ الشعوب الإسلامیة، بروکلمان، ل٦٠٢؛ وە (اسلام و ملیگرایی)، ل١٢.

چونكە لەو سەرو حەدیدا ولآتانی ڕۆژئاوا لەگەرمەی تین و تاوی بەرەوپێش چوون و هەنگاو هەڵێنانی لێكدا لێكدا بوون، بەرەو پەی بردنی زیاتر بەنهێنییەكانی سروشت و دیتنەوەی یاساكانی، هەڵبەتە لەئەنجامی ئەوەش دا پیشەسازیو بازرگانیو كشت و كاڵ و دیاردەكانی تری ژیانی ماددی بەرەوپێشەوە دەچوون، هەتا وای لێهات ولآتانی ڕۆژ ئاوا لەئەنجامی پێشبڕكێ (مسابقة)یان دا بۆ داهێنانی زیاترو بەرهەم هێنانی زیاتر، چاویان بریە ولآتانی دراوسێیان، تاكو هەم كەرەسەی خاو بۆ كارگەو ئامێرەكانیان دابین بكەن، هەم بازاڕێك پەیدا بكەن كە بەرهەم و كەل و پەلەكانیانی تێدا بفرۆشن و ساغ بكەنەوە!

ئەمە لەلایەكەوە، لەلایەكی دیكەشەوە لەئەنجامی بەرەو پێش چوونی زانیاریو زەین ڕوون بوونەوەوە، وردە وردە خەڵك دەستی كرد بە پەی بردن و هەست كردن بە ئەفسانەییو پڕ هەڵەو پەڵەیی زۆربەی زۆری بنچینەو دەستوورەكانی ئایینی گۆڕراوی مەسیحی[1]، ئینجا لەسۆنگەی ئەوەوە كەلەمێژبوو خەڵكی ئەوروپا لەژێر سەنگ و تینی نیری زۆرداری دارودەستەی كڵێسادا دەینالآند، چەند كەسێكی ڕق هەستاوی داخ لە دڵ ئەو هەل و مەرجەو بارودۆخەیان بەدەرفەت زانیو، لەڕێی چەند بیردۆزەیەكی بەناو زانیاریانەوە دەستیان كرد بە ڕشانەوە نەك هەر بەرانبەر بەكڵێساو دارو دەستەكەی، بەڵكو بەرانبەر بەئاین و بنچینەو بنەڕەتی ئایینیش، بەو جۆرە (داروین) بەناوی زانیاری گیانەوەرزانییەوە مرۆڤی بەمەیمون زادە لەقەڵەم داو، (فرۆید) بەناوی دەروونزانییەوە مرۆڤی سەرتاپا لەجلیتاوی جینس هەڵكێشاو، ڕای گەیاند كە تەنانەت ئاین و خواپەرستیو ڕەوشت و خووش هەر لەكانیاوی جینس هەڵقوڵیون، ئینجا ماركسی (بەرەچەڵەك جوولەكە)ش هێندەی دی قوڕەكەی خەست كردو بەناوی ئابووری زانییەوە، گوتی: ئابووری تاقە هاندەرو پاڵنەری مرۆڤە -تاك و كۆمەڵ- لەهەموو بوارەكانی ژیانیدا، واتە ئابووری سەرچاوەی پەیدا بوونی هەموو دیاردە ماددیو مەعنەویەكانی ژیانی ئینسانە لە ئاین و ڕەوشت و فەلسەفەو زانیاریو... هتد.

---

[1] بێگومان لێرەدا مەبەست لەو ئاینە ڕاست و دروستە خواییە نیە كە بۆ (عیسی) علیه السلام نێررا، بەڵكو مەبەست لەو بیروبۆچوون و خەیاڵانەیە كەزادەی بیرو هۆشی نەخۆشی ڕابەرو پێشەوایانی كڵێسا بوون.

وەك دەبینین هەرکام لەداروین و فرۆیدو مارکس، بەڵام هەرکەسە بەشێوازی خۆی، دەیەوێ بۆ خەڵکی دەرخات کە مرۆڤ بەس بریتی‌یە لەو جەستە ڕواڵەتی‌و بەرهەستەو هیچی دی! ئایین و ئەو بناغەیەی کەلەسەری وەستاوە ئەفسانەیەو دژی واقیع و زانیاری‌یە[1]!

بێگومان لەئاکامی ئەوەشدا ڕێزو حورمەتی ئایینی مەسیحی‌و دام و دەزگای کڵێسا تا ئەندازەیەکی زۆر لە دڵ و مێشکی خەڵکەکە کەم بۆوەو، بیروبڕوای ئایینی‌یان لەدڵدا کزبوو، بەڵام چونکە وڵاتانی ئەورووپا لەو دەمی‌دا سەرگەرمی جەنگ و هەراو سنوور شکاندن و یەکتر گەوزاندن بوون، هەستیان کرد کە دوای کزبوونی بیروبڕوای ئایینی لەدڵ و دەروونی گەل دا پێویستە ئەو دڵ و دەروونە بۆشانە بەشتێکی دیکە پڕ بکرێنەوە نەوەك خەڵکەکە سارد بێتەوەو لەپێشبڕکێی تەکنۆلۆجیایی‌دا وەپاش بکەون و بەجێ بمێنن.

جا لەکاتێکا کە وڵاتانی ئەورووپا لەوپەڕی چالاکی‌دا بوون لەبواری بەرەو پێش بردنی وڵات و بەرهەم هێنان و داهێنان و گەڕان و سوڕان و لێکۆڵینەوەدا، جیهانی ئیسلامی -کە ئەرکی خەلیفایەتی بەدەست تورکە عوسمانی‌یەکانەوە بوو- لەوپەڕی پەرتەوازیی‌و بێ‌سەرەو بەرەیی‌و نەزانی‌و بەجێماوی‌دا دەیان گوزەراند، لەسۆنگەی لادان و دوورکەوتنەوەیانەوە لەقورئان و سووننەت و ڕاستە شەقامی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵە بەرێزەکانی.

هەڵبەتە لەئاوا حاڵێکدا دڕندەیەکی جیهان خۆری بێ‌ئایین و بێ ویژدانی مێشك بەبیرو فەلسەفەی (ناسیۆنالیزم) ئاودراوی، وەك ئەورووپا، مەحاڵە بەسەر نێچیرێکی وا تووك نەرمی سادەو ئاسان باز بدات!! بۆیە ئەورووپا کەوتە قم خۆش کردن و ددان سوین لەو نێچیری وا سەربەخێرو وا ئاسان و دەستەمۆ.

ئەمما لەبەر ئەوەی ئەورووپا لەجەنگی چەکدارانەدا زۆری لەدەستی مسوڵمانانی پێشوو چێژتبوو چ لەسەردەمی (صلاح الدین)ی ئەییوبی‌و چ لەسەردەمی زێڕینی تورکە عوسمانی‌کاندا[2]، بۆیە نەوێرا لەمەیدانی جەنگی چەکدارانەدا بەرەنگاری مسوڵمانان بێ، جا لەسۆنگەی ئەوەوە ئیمپریالیزمی جیهان خۆر ویستی پێشەکی جەنگی بیروبڕواو دەروونی

---

(١) لەئەڵقەی یەکەم و دووەم و سێیەمی زنجیرەی (ئیسلام و ڕێچکان)دا کەم تا کورتێك بەرپەرچی ئەو بیردۆزانە دراوەتەوە.

(٢) بۆ ئەوەی مەردایەتی‌و زەبر وەشێنی مسوڵمانانت لەو سەردەمانەدا بۆ دەربکەوێ‌و بزانی چ کارێکی بەئەورووپای جیهان خۆری ئێستا کردوە، سەرنجی کتێبی (الفتوحات الاسلامیة) ، ب١، ل١-٢ بدە، نووسراوی: احمد زیني دحلان.

(الحرب النفسية) لەگەڵ مسوڵمانان‌دا بەكار بێنێ، بۆ ئەوەی ببێتە ڕێ تەخت كەرو ئامادە كردنێك بۆ جەنگی داهاتوو.

ئینجا كاتێك كەوتنە سەر نەخشە كێشان و پیلان دانان بۆ دەست پێكردنی ئەو جەنگە فیكریو دەروونی‌یە، زانیان كەسەر كەوتووترین هۆ بۆ بەڕێوەبردنی پیلانی (پەرتكەو زاڵبە) (فرق تسد) لە نیشتیمانی ئیسلام دا بریتیە لەبیری نەتەوەپەرستی (ناسیۆنالیزم) چونكە ئوممەتی ئیسلامی بەهۆی بیروبڕوای ئیسلامی‌یەوە بوو كەلە ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لەژێر ئاڵای یەك دەوڵەتدا كۆبوونەوە جا ئەگەر هاتوو نەتەوە پەرستیو نیشتیمان پەرستی جێی خواپەرستی گرتەوە، ئەوە عارەب بەعارەبایەتی‌یەوە دەنازێو كورد بەكوردایەتی‌یەوەو فارس و تورك و هیندیو... هتدیش بەهەمان شێوەو، ئەو كاتیش پارچە پارچە دەبن و هێزو پێزی جارانیان نامێنێ، هەر بۆیەش خوای زاناو میهرەبان پێی فەرموون ﴿ولاتنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم..﴾ الأنفال (٢٦).

جا لەبەر ئەوەی لەو سەردەمەی‌دا دوو شوێن لەنیشتیمانی ئیسلامی‌دا لەهەمووی گرنگتر بوون، چونكە یەكەمیان جێگەی خەلافەتی ئیسلامی بوو كە توركیایەو، دووەمیشیان وەك مێشك وابوو سەبارەت بەجیهانی ئیسلامی كەمیسرە، لەبەر ئەوە ئیمپریالیزمی جیهانخۆری ڕۆژ ئاوا لەسەرەتاوە لەودوو وڵاتەوە دەستی پێكرد، ئەویش بەهۆی بەكرێگرتنی دەستەیەك لەچڵكاو خۆرو كاسەلێسانی خۆی، بەو جۆرە لەمیسرو توركیادا دەست كرا بەلێدرانی دەهۆڵی عارەبایەتیو توركایەتیو، دواتر ئەو میكرۆبە پیسەی (ناسیۆنالیزم) هەموو جیهانی ئیسلامی تەنیەوەو، لەئاكامدا نەتەوە پەرستەكانی توركیا لەژێر چاودێری سەهیۆنیزم و ئیمپریالیزمی جیهانی‌دا بەڕابەرایەتی (كەمال ئەتاتورك) خەلافەتی عوسمانی‌یان كۆتایی پێهێناو ڕژێمێكی نەتەوە پەرستانەیان دامەزراند لەسەر بنچینەیەكی بێدینی (عەلمانی)و، نیشتیمانی ئیسلامی پارە پارە كرا.

ئەمە كورتەیەك بوو دەربارەی مێژوو و چۆنیەتی سەرهەڵدانی بیری نەتەوە پەرستی لەجیهاندا بەگشتیو لەنێو مسوڵمانان‌دا بەتایبەتی[1].

---

[1] لەبەشی دووەمی ئەم كتێبە لەچەند كورتە باسێكدا بەدرێژی باسی چۆنیەتی سەرهەڵدان و گەشەكردنی بیری ڕەگەزپەرستیو نەتەوەپەرستی دەكەین، لەجیهاندا بەگشتیو لەنێو ئوممەتی ئیسلامی‌دا بەتایبەتی. تێبینی: بۆ حاڵی بوون لەچۆنیەتی كۆتایی پێهاتن و ڕووخێنرانی دەوڵەتی عوسمانی سەرنجی (كيف هدمت الخلافة؟) بدە، نوسراوی: عبدالقديم زلوم.

جا خوێنەری بەڕێزا

ئەم وتـو وێـژەی بەردەسـتت توێژینەوەیەکـە کەمێلـە سـەرکی‌یەکانی لـەڕووداوێکی واقیعـی وەرگیراون، هیوادارم توانیبم هەڵوێستی بەرنامەی خوا سەبارەت بە هـەرکام لە (نەتەوایـەتی) - کە بریتیـە لەسۆزێکی نەتـەوەیی‌و غەریزەیـەکی سروشتی- وە (نەتەوەپەرستی) -کەبریتیـە لە ڕاز هێنان لەخواپەرستی‌و داتاشینی بت و سـەنەمێکی گونجاو لەگەڵ ڕۆژگاردا بەناوی نەتـەوە یان نیشتیمان - بخەمەڕوو، هەڵبەتـە بۆیـەش شانم بەبەر نووسینی ئەم باسـەدا کرد، چونکە: زۆر چاک ئاگادارم، کـە نیـو سـەدە پـترە مەسـەلەی نەتەوایـەتی‌و نەتەوەپەرسـتی لـەنێو گـەلی کوردمـان دا -گـەلی کورد بەهـەموو بەشـەکانیەوە- کراوەتـە کراسـی عوسمـان و هەردەمـە یـەکێك بەدەستیەوە دەگرێ‌و بەڕاست یان بەدرۆو بەفێڵ، گەلی کوردی پێ دەهاروو‌ژێنێ‌و دوای ئارەق و خوێنێکـی زۆر دەسـتی پـێ لـەبنی هەمبانـە دەردێنـێ‌و کۆشـکی بـەرزی خـەون و خـەیاڵانی لێ دەرمێنێ!

جا بۆ ئەوەی گـەلی کوردی مسوڵمان چیدی بەدوای کڵاوی خوار نەکەوێ‌و، چیدی دەسـت بەهەمبانەی بەتاڵدا نەکات و، ئارەق و خوێنی خۆی لەڕێی خوارو بێ‌بەرهەمدا بەفیڕۆنەدات!

وە زۆر باش بزانێ کـە بـەس لەبەرنامـەی خـوادا شیفاو دەرمـانی دەردو نەخۆشیەکانی خۆی چنـگ دەکـەوێ‌و، لەئیسلامیش بـەولاوە هیـچ شـتێکی دیکـەی دەفریـا نایـەت، وەك دەفریـای نەهاتوە، هەستام بەنووسینی ئەم وتوێژە.

تاقە سەرچاوەی باسەکەشم قورئانی بەڕێزو سوننەتی پێغەمبەرﷺ و مێژووی ئیسلام بووە.

جالە خوا دەخـوازم ئەم نووسینەم مایـەی ڕەزامـەندی وی‌و زیـاتر لەئیسلام وەنزیك خستنی گەلەکەم بێت.

﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾

علی باپیر

دێی سەرسیان ـ ناوچەی بەری مەرگە

١٤٠٤ك - ١٩٨٤ز

# ڕێ خۆش کردن

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم کتێبە لەم چاپی دووەمەدا باس و بابەتەکانی ئاوا ڕیز کراون:

بەشی یەکەم: کە (دەقی وتو وێژەکە)یەو بناغەو بنەڕەتی ئەم کتێبەشە زۆر لەمەسەلە گرنگ و حەساسەکانی نەتەوایەتی لەڕوانگەی ئیسلامەوە تێدا خروانە ڕوو.

بەشی دووەم: (بیری ناسیۆنالیزم و نەتەوەپەرستی) لەچەند خاڵێکدا، بریتی‌یە لەحەوت کورتە باس دەربارەی پێناسەو ڕوونکردنەوەی ماهیەت و مێژوو و پەرێزی بیری نەتەپەوەپەرستی، بۆ ئەوەی هیچ کەس لەپەناێ (سۆزی نەتەوایەتی)دا کە وەك لەبەشی یەکەمدا ڕوونمان کردۆتەوە شتێکی خواڕسك و شەرعی‌و ڕەوایە، لەپەنای (مافی نەتەوایەتی)دا -کەخوای دادگەر بەهەموو گەل ومیللەتانی بەخشیوە- کەڵکەڵەی نەتەوەپەرستی‌و نیشتیمان پەرستی نەچێتە کەللەوەو پێشی وابێ ئیسلام ڕێگای داوە، وەك بەداخەوە گەلێك عارەبی ڕەگەزپەرست بەناهەق بەناوی ئیسلامەوە بانگەشەی بۆ دەکەن! بەڵێ ئامانجی بەشی دووەم ئەوەیە کە (ڕەوا)و (ناڕەوا)و (پاك)و (پیس) لەمەسەلەی نەتەوایەتی‌دا لێك جیا بکەینەوەو لێمان تێکەڵ نەبن.

بەشی سێیەم: (ئیسلام و کوردو ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستی‌یەك) ئەمیش بریتیە لەحەوت کورتە باس کەهەموویان لە سوورگەی پەیوەندی نێوان ئیسلام و کورددا دەخولێنەوەو، تەم و مژی چەند بۆچوونێکی هەڵە دەربارەی ئیسلام و هەڵوێستی لەمەڕ کێشەی کورد ڕەوێنراوەتەوەو، بەڕاشکاوی هەڵوێستی ئیجابی‌یانەی ئیسلام و پشتگیری مەحکەم و نەلەخشاوی لەکێشەی ڕەوای کورد کەستەمدیدەیی‌و ماف زەوتکران و بێ‌ناوونیشان کرانە خراوەتەڕوو.

بەشی چوارەم: (مسوڵمانەتی‌و کوردایەتی لەڕوانگەی ئیسلام و عەلمانیەکانەوە) ئەمیش کەبەشی کۆتایی‌یەو لەم چاپی دووەمەشدا زیاد کراوەو یازدە (١١) کورتەباسی گرنگی گرتوونە خۆی‌و زیاتر پەیوەندی‌یان بەواقیعی ئیستامانەوە هەیەو (هەنووکەیی)ن و، دوایین هەڵوێست و بۆچوونی بەندەشن لەمەڕ ئەو مەسەلەو بابەتانەی کە توێژراونەتەوە، هیوادارم هەموولایەك -بەتایبەتی برادەرانی لائیك- بەبێ هەڵچوون و گرژبوون و بەسنگی فراوانەوە سەرنجی ئەو باسانەو باسەکانی دیکەش بدەن و هەر تێبینی‌و ڕەخنەیەکیشیان هەبوو بەشێوازێکی

بابەتی‌یانە بیخەنە ڕوو، بەندەش لێرەوە ڕای دەگەیەنم کەهەر شتێکم لە م کتێبە -وەهەر بەرهەمێکی ترم-دا گوتوە ئەگەر ڕاست و دروست بوو ئەوە لەخواوەیەو ئازایەتی ئیسلامەو، ئەگەر هەڵەوناتەواویش بوو ئەوە من بەهەڵەدا چووم و ئیسلام لێی بەریەو خواش پشتیوان بێ هەرکات هەستی پێبکەم و بۆم دەربکەوێ دەستبەجێ دەستبەرداری دەبم و زۆریش مەمنوونی هەرکەسێك دەبم کەهەڵەوناتەواوی‌یەکی خۆمم بخاتە بەرچاوو وەك دیاری (هدیة) تەماشای دەکەم، چونکە دڵنیام کەهەموو ئینسانەکان جگە لەپێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاه السلام) کەلەبەر متمانە پێکرانی تەواو بۆ ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوا، خوای کاربەجی لە هەڵەو تاوان پاراستوونیو، ئەگەر شتێکیشیان لەوبارەوە بەهۆی ئەپێکانی ئیجتیهادەکانیانەوە لێ‌پشکووتبێتەوە، خوای میهرەبان یەکسەر ئاگاداری کردوونەوەو بۆی ڕاست کردوونەوە، بەو جۆرە لەئاکامدا پارێزراو (معصوم)ن لەهەڵەو کەم و کوڕی لەهەموو ڕوێکەوە، بەلام لەو زاتە بەرزو ئاوازانە بەولاوە کە بەسەروەرو گەورەیان موحەممەدﷺ کۆتایی‌یان پێهاتووە، هیچکەس نیە کە کەم و زۆر تووشی هەڵەو کەم و کوڕی نەبووبێ‌و نەیەت، مەگەر کەڵە پیاوی وەك عومەری کوڕی خەتتاب -کەپێغەمبەرﷺ لەچەندان فەرموودەی (صحیح)دا مەدحی زۆر سەرسوڕهێنەری کردوە- نەیفەرمووە (رحم الله امرأ اهدی إلي عُیوُبي) ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کە ناتەواویەکانی خۆمم بەدیاری بۆ دەنێری؟!

جا دەبێ ئێمەو مانان و لەڕۆژگاری ئێستاماندا حاڵ و وەزعمان چۆن بێ!! کەبێگومان ئەگەر لەبەر ناچاری‌و لەترسی گوناحباری نەبێ جورئەتی ئەوە ناکەین لەو ئاستەی خۆماندا دەربارەی ئیسلام بەو بەرزی‌و مەزنی‌یەی بدوێین!

بەلام کەدەبیستین پیغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (بَلغوا عَني وَلَو آیة) رَواه البخاري، وەسەرنجی خۆشمان دەدەین دەبینین کە -الحمد لله- لەچاو خەڵکێکی زۆر کە لەگێژی نەزانی‌و بێ ئاگایی‌دا دەخولێنەوە، سەرەدەرێك لەئیسلام دەکەین و شتێکی لێدەزانین، ئائەوە پاڵمان پێوە دەنێ کە بێدەنگ دانەنیشین و لەسەر ئیسلام و بۆ خستنەڕووی ڕووی گەش و جوانی ئیسلام ڕەدەنگ بێین و، بەپێی تواناو بڕستمان خزمەتێك بەگەڵ مسوڵمانمان بکەین و شوێنەوارێکی باش لەپاش خۆمان بەجێ بهێڵین و بۆ ڕۆژێك کەبێجگە لەئیمان و کردەوەی چاك دادی ئینسان نادات پاشەکەوتێك بکەین.

ربنا تقبل منا إنك انت السمیع العلیم وتب علینا إنك انت التواب الرحیم

# دوو ئاگاداری گرنگ

یەکەم:

لەهەر جێیەك وشەی (کوردایەتی) یان (نەتەوایەتی) یان (نیشتیمان پەروەرێتی)مان بەکار هێنابێ، ئەوە مەبەستمان پێ(سۆزی نەتەوایەتی) یان (مافی نەتەوایەتی)یە نەك ناسیۆنالیزم (نەتەوەو نیشتیمان پەرستی)، وەمەگەر چۆن دەنا لەحاڵەتی زەم و بەناڕوا لەقەڵەم دانیشدا هەر وشەی ناسیۆنالیزم (نەتەوەو نیشتیمان پەرستی) یان (بیری نەتەوایەتی) بەکار دێنین، چونکە هەست و سۆزی گەل و نیشتیمان دۆستی کە شتێکی خۆڕسك و (فطری)یە، وە مافی نەتەوایەتی (بەئازادی‌و ئیرادەی خۆ لەخاك و ئاوی خۆدا ژیان) کە شتێکی ڕەواو شەرعی‌یە، هەر کاتێك کرانە ئیدۆلۆژی‌و ڕێباز، ئەوە لەحاڵەتی شەرعی‌و ئاسایی خۆیان دەرچوون و جێگایان بەخواپەرستی لەدڵی خاوەنەکەیاندا لەق کردوەو، دووچاری جۆرێك لەبت و صەنەم پەرستی‌یان کردوە.

دووەم:

شتێکی ئاشکرایە کە مسوڵمانان بەهەموو گەل و هۆزو خاك و وڵات و ڕەنگ و زمانە زۆرو جۆراو جۆرەکانیانەوە یەك کۆمەڵ (أمة واحدة)ن ولەسەریشیان فەرزە کە هەموویان لەژێر یەك بەیداخ و لەنێو یەك قەوارەداو مل کەچی فەرمانی یەك فەرمانڕەوا بن، لەگەڵ ڕێزگرتن لەپێکهێنەرو تایبەتمەندی‌یەکانی هەر گەل و نەتەوەیەك و پاراستنیشیان، دیارە لەو حاڵەتەشدا سەرجەم مسوڵمانان بەبێ هیچ جۆرە جیاوازی‌یەك لەنێوانیاندا بەهۆی ڕەنگ و زمان و ڕەگەزو نیشتیمان و... هتدیانەوە وەك یەك بەشدارن لەبەڕێوەبردن و مشوور لێخواردنی ئەو دەوڵەت و قەوارەیەیان و هەر کەس بەگوێرەی خەسڵەت و مەرجە بەپێویست گیراوە شەرعی‌یەکان و بەئەندازەی لیاقەت و شایستەی خۆی ئەرك و کار بەئەستۆوە دەگری‌و لەشوێنی شیاوی خۆی دادەنرێ.

جا ئاشکراو ڕوونە کە لەکۆمەڵگایەکی ئاواو لەژێر سایەی حوکمێکی وادا پاساو (مبرر)ی عارەبایەتیو تورکایەتیو فارسایەتیو کوردایەتیو چیو چیایەتی نیە، چونکە کەس بەتەنیا حوکمڕان نیە، تاکو ئەوانی دیکە کە ژێردەستەن بۆ ئیسپاتی بوونی خۆیان وەك نەتەوەیەك، ئاڵای نەتەوایەتی بەرز بکەنەوەو داوای مافی ڕەوای خۆیان بکەن! کەواتە: ئێمە بۆیە لەم بارودۆخەماندا بەخۆمان ڕەوا دەبینین کە ڕێك و ڕاست باسی کوردایەتیو مافی نەتەوایەتی کورد بکەین، چونکە تێکڕای ئوممەتی ئیسلام و بەتایبەت خۆمان و برا مسوڵمانە عارەب و تورك و فارسە دراوسێکانمان لەحاڵەتێکی ناشەرعیو نائاساییدا دەبینین، جانەگەر ئیسلام بۆ حاڵەتی ئاسایی حوکم و بڕیاری ئاسایی داناون، دیارە بۆ حاڵەتی نائاساییو ڕێزپەڕ (شاذ)یش حوکم و بڕیاری نائاسایی دیاری کردوون، وەك فەرموویەتی ﴿..فمن اضطُر غير باغٍ ولا عادٍ فلا إثم عَلَيه﴾ المائدة، بەڵێ... بێگومان ئەوەی کە لەحاڵەتی ناچاریو تێگیران و لێقەوماندا بۆ ئینسان حەڵاڵ و موباح دەبێت لەحاڵەتی ئاساییدا ئەو هەقەی پێنادرێ، چونکە خۆیشی پێویستی پێی نیەو پەکی لەسەری نەکەوتوە.

## بەشی یەکەم:

# دەقی وتو وێژەکە

**کاتی ڕوودانی ئەم وتو وێژە:**

**ئاخرو ئۆخری پایزی ساڵی ١٩٨١ ی زایینی**

**شوێنی وتو وێژەکە:**

**شارۆچکەی (ڕەبەت)ی سەربەشاری (سەردەشت)ی کوردستانی ئێران**

# سەرەتاو دەست پێکردنی ئەم وتو وێژە

لەساڵی (١٩٨١) ی زایینی لەبەر ئەوەی ڕازی نەبووم ببمە بەعسیو بەرگی سوپای بەناو گەل (جیش الشعبي) دەبەر بکەم و گەردن بۆ فەرمانی ڕژێمی بەعسی عەفلەقی کەچ بکەم، قاچاغ بووم و دوای دەرچوونی فەرمانی گرتن (امر القبض)م لەلایەن ڕژێمەوە ناچار بووم سەری خۆم هەڵبگرم و وڵات و نیشتیمانم بەجێبهێڵم.

بێگومان ئەوە تەنیا منیش نەبووم کە دەبوو بەهۆی لەگەڵ ڕژێم نەحەوانەوەیەوە بەناچاری سەری خۆی هەڵبگرێو نیشتیمانی بەجێبهێڵێ، بەڵکو سەدان کەسی دیکەش دووچاری ئەو دەربەدەرییو ئاوارەیی یە دەبوون.

جاسەبارەت بەمن و کەسانێکی وەك من کە بابایەکی ئیسلامی بووین و بڕوامان بەڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤ کردە لەملاو ئەولاڕا هێنراوەکان نەبوو و، ئامادەش نەبووین تاقە شەقاوێکیش لەگەڵ ئەو پێڕەو تاقمانەدا بڕۆین کەلەسەر بنچینەی ڕێچکەو بیردۆزەکان بنیات نراون، بەڵێ بۆ کەسانێکی وەك ئێمە، مەسەلەی دەربەدەرییو ئاوارەیی یەکجار سەخت و دژوارو پڕ ئێش و ژان بوو!

چونکە حەیفێ مسوڵمانانی پێش ئێمە (ئیسلامی)یانێکی کەم تەرخەم و نەجووڵاوو بێمشوور بوون و هیچ خەمێکیان لەئیسلام و گەلەکەیان نەخواردبوو و، هەوڵیان نەدابوو ئەوانیش وەك پێڕەو تاقمە عەلمانیەکان جێ پێیەك بۆ خۆیان پەیدا بکەن و، وەزعێك بسازێنن کە چوار مسوڵمانی ئاوارەو بێپەنا بتوانن سەریان پێبهێنن و بیان حەوێننەوە !!

جامن نامەوێ لێرەدا داستان و سەرگوزشتەی یەکەمین کۆچکردن و ئاوارە بوونم لەبەشە کوردستانی عێراقەوە بۆ بەشە کوردستانی ئێران و پاشان بۆتاران و... هتد بگێڕمەوە، چونکە گێڕانەوەی ئەو داستانە پڕ کەندو لەندو تاڵیو سۆزێرییو پەندو عیبرەتە حەوجێی شوێنێکی تەرخان و سەربەخۆیە، بەڵام من مەبەستم لەم قسانە ئەوە بوو کە خوێنەری بەڕێز ئاشنا بکەم بەو بارودۆخە نەفسیو سیاسییەی کە وتو وێژەکەی تێدا ڕوویداوە، چونکە ئاشنابوونی مرۆڤ بە بارودۆخ و کات و شوێنی ڕوودانی هەر مەسەلەو ڕووداوێك یاریدەیەکی چاکی ئەدات بۆ

چاکتر حاڵی بوونی لەو مەسەلەو ڕووداوەو، پتر پەی بردنی بەو قەسەو باسانەی کە لە لابەلای ئەو بابەتەدا دەخرێتە ڕوو...

ئێستاش کە هەتا ڕادەیەك باروذۆخ و کات و شوێنی گشتی درووست بوونی ئەم وتو وێژەت زانی، با یەکسەر بچینە سەر ئەسڵی مەبەست و، هیواداریشم لە لاپەڕە هەڵدانەوە بەتاڵوکە نەبی‌و بۆ لێبوونەوە بەپەلە نەبی، چونکە زۆر شتی گرنگ و بەقیمەت دۆزینەوەیان پەکی لەسەر وردبوونەوەو پەلەنەکردن و تێوەڕامان کەوتوە!

... پاییزی ساڵی (١٩٨١)ی زایینی هاتبۆ بڕانێ، ئێوارەیەکی ڕێم کەوتە شارۆچکەی (ڕەبەت)ی‌ۆ، شەوێ لە ماڵێکی میوان بووم، ماڵە خانەخوێیەکەم بێجگە لەمن و خاوەن ماڵ سێ کەسی دیکەشی لێ بوون، هەرسێکیشیان شوێنکەوتووی یەکێك لەو کوێرە ڕێو ڕێچکانە بوون، کە لەتەرازووی ڕێبازی پەروەردگاردا هێندەی پووشکەیەك سەنگ و کێشیان نیەو، بێجگە لەسەرگەردانی‌و خاکە ساری‌و ماڵوێرانی هیچی تریان لەهەگبەیدا نیەو، هەر گەل و کۆمەڵێك بڕوایان پێ بێنی‌و شوێنیان بکەوێ، دابڕدابڕو پارچە پارچە دەبی‌و دەبنە سەدو یەك پێڕو تاقم و لەبەر دوژمنایەتی نێوخۆ، ئاگایان لەدوژمن نامێنی‌و بەردەبنە گیانی یەکدی‌و دوژمن بەخۆیان خۆش دەکەن.

دوای نان خواردن قسەو باس هاتنە گۆڕی‌و، کۆڕەکەمان گەرم بوو، سەرتان نەیەشێنم، قسان درێژەیان کێشاو لکیان لێبوونەوە زۆری نەبرد، لکێکیان هاتە سەر مەسەلەی کورد، پرسیارم لێ کردن: بۆچی لەم قۆناغە مێژوویی‌یەدا پشتتان لەئیسلام کردووەو، کەم و زۆر نای هێننە نێو حیساباو و پەناتان بردۆتە بەر کوێرە ڕێیەکی دژ بەژیری‌و زانیاری‌و نەگونجاو لەگەڵ سروشتی ئینسان دا؟!!

یەکێکیان –کەوا دیاربوو نەمڕاست و ڕدێن سپی‌بوو– ئاوا وەڵامی دایەوە:

ئێمە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی دوورو درێژدا بۆمان دەرکەوت کە مارکسیزم باشترین دەرمانی دەردی گەلی کوردەو مەڵحەمێکی زۆر کاریگەرە بۆ چاکبوونەوەی برینی سەدان ساڵەی‌و سارێژ کردنی، بۆیە وەك بەرنامەو پەیڕەوێك پەنامان بردەبەر.

گوتم: بەڵام وەڵامت نەدامەوە لەسۆنگەی چی‌یەوە پشتتان لەئیسلامەتی کرد؟!!

گوتی: نەخێر وەڵامی ئەو پرسیارەم نەدایەوەو ناشمەوێ وەڵامی بدەمەوە.

گوتم: بۆچی؟!

گوتی: چونکە پیاو هەقێ بلێ لەبابەت ئیسلامەوە زۆرم لەدڵی دایە، گەلەئەشمان ئێستا ماویەتی بگاتە ئەو ئاستەی کە بێ پەردە هەموو ڕاستی‌یانی بۆ بخەیەڕوو و لێفەی بۆ لەسەر هەتیوان هەڵدەیەوەو بۆی لەبنی کوولەکەی بدەی.

گوتم: وەڵلاهی دەنا بەدڵ حەز دەکەم بزانم سەبارەت بەئیسلام چت لەدڵی خۆتدا حەشاردەاوەو ناتەوێ کەس پێی بزانێ، عوزرەکەشت زۆر بەجێ نیە، چونکە ئێستا کەسی وای لێ نیە شیاوی ئەوەبێ ئەم جۆرە مەسەلانەی لێ پەنابرێن و وەشاربرێن[1].

گوتی: کاکە بەڕاستی ئیسلام زۆر شووم و بێ‌خێر بووە بۆ گەلی کوردو گەلێك نەگبەتی بەسەر هێناون و زۆر زیانی پێ گەیاندوە، لەبەر ئەوە من لەدەرفەتێکی ئاوا سەرپێی‌دا توانام نیە هەمووان بخەمە ڕوو، بەڵام پێشینان گوتوویانە: لوێچێك نموونەی تەغارێکە، منیش بۆ نموونە بڕێکیانت دەخەمە بەرچاو.

گوتم: فەرموو!

گوتی: یەکەمین پێلاقە کە لە سایەی ئیسلامەوە بەگەلی کورد کەوتوە، داگیرکرانی خاك و ئاویان بوو بەدەستی هێندێك عارەبی پێخواس و کەس نەناس، کە هاتن گەلی سادەو نەفامی کوردیان فریوداو، موڵك و ماڵیان داگیرکردن و، بەناوی ئایینەوە خۆیان لێ کردنە ڕابەرو پێشەواو بەربوونە چەوساندنەوەیان.

دووەم: کە هەر ئەنجامی پێلاقەی یەکەمە، ئەو عارەبانەی کە بەناوی ئایین ڕاگەیاندنەوە هاتبوون پاش ئەوەی پێی خۆیان چەقاند، دەستیان کرد بە پەرەپێدانی ڕێو ڕەسم و عادەت و نەریتی خۆیان و، جێگیر کردن و ڕەواج پێدانی ئەدەب و زمان و کەلەپووری نەتەوایەتی خۆیان و، لەسەرێکی دیکەشەوە کەوتنە هێرش بردنەسەر هەر شتێك کەپەیوەندی بەکوردو کوردایەتی‌یەوە هەیە لەنەریت و عادات و ئەدەب و زمان و، هەرلیان دا هەموو شتێکی خۆماڵی لەبەرچاوی کوردان دزێو بکەن و ببێزێنن، بۆئەوەی گیان و کەسایەتیمان لەدەست بچێ و

---

[1] خوای باڵادەست سەبارەت بەو جۆرە کەسانەی کەناوێرن بیری پووچ و داخی نێو دڵیان لەنێو مسوڵمانانادا بخەنەڕوو، فەرموویەتی ﴿قد بدت البغضاء من افواههم. وما تخفي صدورهم اكبر﴾ آل عمران (١١٨)، واتە: ڕق و قین و دوژمنایەتی لەزارو زمانیانەوە ئاشکرا بووە، بەڵام ئەوەی کە دەروون و سینەیان شاردوویەتەوە گەورەترە.

نارەسەن و بێبنەچەکە بکەوینە گۆڕێ، هەڵبەتە ئەوەدەمیش چەوساندنەوەو ڕامکردنمان سیناتر دەبێت.

سێیەم: ئیسلام دوای ئەوەی لەخاکی ئێمەدا چەقەرەیداو ڕەگی داکوتان، بوو بەماك و سەرچاوەی گەلێك دەردو نەخۆشی کۆمەڵایەتی ی وەك: سۆڵی گەری و دەرویشیی و شیخایەتی، کەوەك گیا کەڵە وابوون بۆ لەنێوبردنی گەل و دواخستنی بەهۆی واز پێ لەدنیا هێنانیی و گەردن پێ کەچکردنی بۆ ستەمکارو داگیرکەران.

چوارەم: زۆر جاران مەلاو پێشەوا ئایینی یەکان زیانیان لەشۆڕشی نەتەوایەتیی و ڕزگاریخوازی گەلی کورد داوە، بەسەرهاتی ڕووخانی فەرمانڕەوایەتی میر موحەممەدی ڕەواندزیش کەبە (پاشاکۆرە) ناسراوە، بەفیتی فتوای (مەلای خەتێ) چاکترین بەڵگەی ڕاستی ئەم قسەیەمانە.

(کابرا دوای ئەوەی لەقسەکانی بۆوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو، پشتی وەدیواری داو دەستی کرد بەقوم لێدانی جگەرەکەیو هەستم پێکرد کەهەروەك چۆن کەسێك کۆڵێکی قورسی بەکۆڵی وەیەو دای دەنێ، چەندە هەست بەئاسوودەیی دەکات ئەویش بەهەمان شێوە!

جا کاتێك ئەو کڕکاتی لەخۆی بڕی، دانیشتوان تێکڕا بێ دەنگ بوون و لێکدا لێکدا کەوتنە سەرنج دانی من و، بەدەردی کورد دەڵێ: چاویان لێ کردمە درێشە، ئەمنیش بێ ئەوەی شێوەی دانیشتنەکەم تێك بدەم، بەشێنەیی گوتم:)

پێم خۆشە هەر بەوەندە واز نەیەنیی و هەرچی لەنێو دڵتدا پەزمەندە بورە هەڵی ڕێژی، چونکە دەبینم لەمێژە ئەو کۆڵە گرانەت هەڵگرتوەو زۆر دەروونی ئازارداویو چاك دڵی پڕ کردووی.

گوتی: بەڕاستی وەك لەسەرەتادا گوتم، زۆرم لەدڵدا کۆبۆتەوەو ئەوانەی گوتمن هەندێکیانن، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوەندە بەسە، چونکە ئەو خاڵانەی خستمنە ڕوو شتە سەرەکییەکانیانن.

گوتم: کەواتە ئەگەر توانیم ئیقناعت بکەم بەوەی کەهیچ کام لەو دەعوایانە لەجێی خۆیاندا نین، یان لایەنی کەم بەرگێکی خەیاڵی ناقۆڵایان دەربەر کراوە، ئیسلام نەك هەر زیانی بۆ گەلی کوردو هیچ گەلێکی دیکەش نەبووە، بەڵکو گەورەترین و بەپیت و پێزترین نیعمەت بووە، نەك هەر ماکی دەردو نەخۆشیەکانی نیە، بەڵکو شیفاو دەرمانی سارێژکردنی دەردەکانیەتی... تۆزێك فێنکایەتیت بەدڵدا دێو دێوەزمەی گومان و بێبڕوایيت بڕێك لەسەر شانان لادەچێ؟!

گوتی: بەڵێ.

گوتم:

## یەکەم: وەڵامی ڕەخنەی یەکەم

جارێ سەبارەت بەوەیان کە جەنابت بەیەکەمین پێلاقەی دەزانی کە گوایە لەسایەی ئیسلامەوە بەکوردان کەوتوە، شتێکی زۆر پێچەوانەو بەراوەژوویە لەگەڵ واقیعی مێژوودا.

گوتی: چۆن؟!

گوتم: چونکە ئەو مسوڵمانانەی کەهاتنە کوردستان و خستیانە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامیو گەلی کوردیان مسوڵمان کردو بەخواپەرستی‌یان ئاشنا کرد، نەبەنیازی داگیرکردن و تاڵان و بڕۆوە هاتبوون، وەنە بەئومێدی خەڵك تەفرەدان و مێشك بەنج کردنەوە، چونکە:

١- وەك مێژوو هەواڵی پێداوین و دۆست و دوژمنیش دانیان پێداهێناوە سوپاو لەشکری ئیسلامی ئەودەمی -کەزۆربەیان برادەرانی پێغەمبەرﷺ بوون- لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو دارایی‌و غەنیمەتەیان چنگ کەوت لەئەنجامی جەنگ دا، هەر بەدنیا بەکەم گرتن و ژیانێکی لام سەللایی ژیاون و بەخەم جل و بەرگ و خواردن و خۆراکەوە نەبوو ون و، تاقە هیواو ئاواتیان ڕازی کردنی خواو شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ و ڕاگەیاندنی بەرنامەی ئیسلام بووە.

جا ئەگەر ڕاستە ئەوان بەئومێدی تاڵان و بڕۆو خەڵك ڕووتاندنەوەو خاك و ئاو داگیر کردن و چەوساندنەوەوە هاتبوون، بۆچی ئەو شتەی کەبەنیازی وەدەست هێنانیەوە خۆیان کردبوە قوربانی‌و ماڵ و منداڵ و نیشتیمانیان بۆ بەجێ هێشتبوو، دوای وەدەست هێنانی نەکەوتوونە سوود لێوەرگرتن و پێوە ڕابواردنی؟!

ئایا ئەو کەسەی لەپێناوی ئامانجێکدا خۆیو دایك و بابی‌و ماڵ و منداڵی‌و نیشتیمانی بەخت دەکات، دوای ئەوەی ئەو ئامانجەی دەستگیر دەبێ بەپەرۆشەوە ئامێزی بۆ ناگرێتەوەو لەباوەشی ناگرێت؟!

٢- هەر کەسێك بڕێك موتاڵای مێژووی ئیسلامی کردبی‌و لەم ڕووەوە توێژینێك سەرەدەری بکات، دەزانێ کە موسڵمانەکان هیچ جۆرە بەرژەوەندی‌یەکی ماددی‌و دنیایی پاڵی پێوە نەناون کە جەنگ لەگەڵ کوردو گەلانی دیکەشدا بکەن، بەڵکو تاقە شتێك کە بۆتە هاندەرو پاڵنەریان ڕاگەیاندنی ئایینی خواو ڕزگارکردنی گەلە ژێردەستەو چەوساوەکان بووە، لەژێر نیرو ڕکێفی تاغووت و زۆرداران.

ئێستاش فەرموون باسەرنجێکی  مێژوو بدەین بزانین لەو بارەوە چۆنمان هەواڵ پێدەدات: مێژووزانی مەزن (ابن کثیر) لەکتێبی (البدایة والنهایة)دا سەبارەت بەچۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونی سوپای ئیسلام لەگەڵ سوپای فارس ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

(... کاتێك سوپای ئیسلام بەسەر کردایەتی  سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و سوپای فارس بەسەرکردایەتی ڕۆستەم پێکەوە ڕووبەڕوو بوون، ڕۆستەم ناردیە لای سەعد کەپیاوێکی ژیرو دانای بنێرێتەلا، تاکو پرسیاری لێ بکات، ئەویش موغەیرەی کوڕی شوعبەی ناردەلا، جاکاتێك چووە لای، ڕۆستەم پێی گوت: ئێوە دراوسێمان بوون و ئێمە چاکەمان  لەگەڵ کردوون و نەمان هێشتوە تووشی ئازارو زیان بن، ئێستاش بگەڕێنەوە وڵاتی  خۆتان، ئێمەش ڕێ لەبازرگانیتان ناگرین کە بێتە نێو وڵاتمانەوە.

موغیرە: گوتی: ئێمە بەدوای دنیا نەکەوتووین، وە ئامانج و مەبەستمان دوارۆژە "ڕازی کردنی خواو شادبوون بە بەهەشتی بەرین"، وەخوای بەرز پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین پێی فەرمووە: من ئەم کۆمەڵە مسوڵمانە زاڵ دەکەم بەسەر هەر کەسێکدا کە شوێن ئایینەکەم نەکەوێ‌و من بەم کۆمەڵە مسوڵمانە تۆڵەیان لێ دەستێنم، وەهەمیشە ئەم کۆمەڵە زاڵ دەکەم هەتا بڕوایان بەم ئایینە هەبێ، ئەو ئایینەش ڕاست و دروستە، هەرچی لێی لادات کەنەفت و ژێر دەست دەبێ، وەهەرچی دەستی پێوە بگرێ سەربەرزو بەهێز دەبێ ڕۆستەم پێی گوت: ئەو ئایینە چی‌یە؟!

گوتی: جارێ بڕبڕەی پشتی کەبەبێ وی هیچ شتێك ناگونجێ بریتی‌یە لە: شایەتی دان و دان هێنان بەوەدا، کە بێجگە لەخوا کەس لایقی پەرستران و گەردن بۆ کەچ کران نیە، وەموحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، وەدان هێنان و بڕواهێنان  بەهەر شتێك کە لەلایەن خواوە هاتوە.

ڕۆستەم گوتی: چ هەیە لەمە چاکتر! ئینجا چی دیکەش؟!

گوتی: وەرزگار کردنی بەندەکان لەکۆیلایەتی بۆ بەندان، بۆ بەندایەتی کردن بۆخوا.

ڕۆستەم گوتی: ئەمەش دیسان چاکە، بەڵام چی دیکەش؟!

گوتی: وەخەڵکی وەچەی ئادەم وحەووان، کەواتە بران و لەیەك دایك و بابن.

ڕۆستەم گوتی: ئەمەش دیسان چاکە.

ئینجا ڕۆستەم گوتی: باشە دەڵێی چی ئەگەر بێینە نێو ئایینەکەتانەوە، واز لەوڵاتی ئێمە دەهێنن؟!

گوتی: بەڵێ ئەرێ وەڵلا لە وڵاتتان نزیك نابینەوە، مەگەر بۆ بازرگانی‌یەك، یان پێویستی‌یەك.

گوتی: ئەمەش باشە.

ئینجا کاتێك موغەیرە چووە دەرێ، ڕۆستەم لەگەڵ دەمراست و ڕدێن سپیانی گەلەکەی‌دا سەبارەت بەئیسلام وتو وێژی کرد بەڵام ئەوان پێشگیری ئەوەیان کردو ڕازی نەبوون بچنە نێوی...)[1].

جا برادەران ئەمە یەکێکە لەو بەسەرهاتانەی کە چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونی مسوڵمانەکانمان بۆ دەربەدەخەن لەگەڵ ئەو گەلانەدا کەوریستوویانە ئایینی خوایان پێ ڕابگەیەنن، وەك دەبینین دادگەری‌و بەزەیی‌و ئاشتی خوازی‌و سینە فراوانی‌و دنیانەویستی وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە لەو مسوڵمانە بەڕێزانەدا کە دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەری ئیسلام بوون.

ئیستاش بۆ چاکتر ڕوون کردنەوەی مەبەست با وێنەیەکی دیکە بێنینەوە:

دیسان هەر (ابن کثیر) لەکتێبی ناوبراودا ئەم بەسەرهاتەشمان بۆ دەگێڕێتەوە:

(... ئینجا سەعد خوا لێی ڕازی بێ لەسەر داواکاری ڕۆستەم نوێنەرێکی دیکەی ناردەلا، ئەویش ڕیبعی کوڕی عامیر بوو، کە ڕیبعی لێی وەژوور کەوت و چووەلای، تەماشای کرد نشینگە (مجلس)ی ڕۆستەمیان بەچەند سەرینێکی زێرکفت کراوو چەند بەڕەو فەرشێکی لەئاوریشم دروست کراو ڕازاندۆتەوە، وە گەوهەرو مرواری بەنرخ خرابوونە بەرچاو، لەگەڵ جوانی‌و ئارایشتێکی زۆردا، وەتاجەکەی لەسەر نابوو و گەلێك کەل و پەلی گرانبای دیکەش ڕانوێنرا بوون، وە ڕۆستەم لەسەر تەختێکی زێڕین دانیشتبوو، ئینجا ڕیبعی بەجل و بەرگێکی تەنکەڵەو، بەشمشێرو قەڵغان و ئەسپێکی کورتەڵەوە هات، دانەبەزی هەتا گەیشتە سەر قەراغی فەرشەکە، دوایی دابەزی‌و ئەسپەکەی بەهەندێك لەکورسی‌و تەختەکانەوە بەستەوە، دوایی هاتە پێشەوە، چەك و زرێ‌یەکەی هەر پێوەبوو، کڵاوە ئاسنینەکەی هەر لەسەر بوو... پێیان گوت: چەکەکەت دانێ، گوتی من بۆیە نەهاتووم بەفەرمانی ئێوە چەك دانێم، بەڵکو بۆیە هاتووم ئێوە بانگتان کردووم، جا ئەگەر لێم دەگەڕێن ئاوا بم چاکە، دەنا دەگەڕێمەوە، ڕۆستەم گوتی: لێی

---

(١) دەقی ئەم بەسەرهاتەم لەکتێبی (البداية والنهاية) وەرگرت، چاپی یەکەم، ب٤، بەشی٧، ل٤٣.

گەڕێن بابێ، ئینجا هاتە پێشەوەو لەسەر سەرینەکان خۆی خستە سەر ڕمبەکەی‌و دڕاندی!

ئینجا پێیان گوت: چ شتێك ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟!

گوتی: خوا ناردووینی بۆ ئەوەی هەرکەسێك بیەوێ ڕزگاری بکەین لە کۆیلایەتی بۆ بەندان بۆ بەندایەتی بۆ خوا، وە لەتەسکی دنیا بۆ فروانی دنیاو دوارۆژ، وەلە ستەم وبێ‌دادی ڕێچکان بۆ دادگەریی ئیسلام، خوا ئێمەی ڕەوانەکردوە بە ئایینەکەیەوە بۆ ئەوەی خەڵك بۆ لای بانگ بکەن، جا هەرکەسێك ئەم ئایینەمان لێ وەربگرێ وازی لێ دێنین و دە گەڕێینەوە، وە هەرکەسێکیش لێمان وەرنەگرێ، لەگەڵی دەجەنگین هەتا دەگەینە گفت و مژدەی خوا، گوتیان: گفت و مژدەی خوا چی‌یە؟! گوتی: بەهەشتە بۆ کەسێك کە لەکاتی جەنگ کردن لەگەڵ ئەوانەدا دەمرێ کە بە بەرنامەی خوا ڕازی نین، وە سەرکەوتنە بۆ ئەوانەی دەمێننەوە.

ڕۆستەم گوتی: ئەوە قسەی ئێوەم بیست، بەڵام ئایا دەگونجێ ئەم کارەتان دوابخەن هەتا ورد دەبینەوەو ڕاوێژی تێدا دەکەین؟!

گوتی: بەڵێ پێتان خۆشە چەند بێ؟ ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ؟!

گوتی: نەء، بەڵکو هەتا نامە دەنێرین بۆ قسەزان و ڕدێن سپی‌و سەرکردەکانمان، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین کەلەکاتی جەنگدا لەسێ ڕۆژان زیاتر لەسەر دوژمنمان ڕانەوەستین، جا چاك لەئیشی خۆت و گەلەکەت وردبەوەو دوای سێ ڕۆژان یەکێك لەسێ شتان هەڵبژێرە[1].

---

[1] ئەو سێ شتانە هێندە زانراو بوو وێن پێویست نەبووە بگوترێن، کە ئەمانەن:

یەکەم: وەرگرتنی ئیسلام و مسوڵمان بوون.

دووەم: ئەگەر مسوڵمان نەبن سەرانە (جزیة) بدەن.

سێیەم: ئەگەر سەرانەش نەدەن ئامادەی جەنگ بن.

لەم فەرموودەیەش دا کە (مسلم) گێڕاویەتەوە ئەو ئەوسێ شتانە -کە مسوڵمان بوون، یان مل کەچ کردن بۆ حوکمی ئیسلامی‌و ئیعلانی دژایەتی نەکردنی کە لە(سەرانەدان)دا خۆی دەنوێنێ، یان بەناچاری ئامادە بوون بۆ جەنگ- زۆر جوان دیاری کراون: (كان رسول الله ﷺ إذا امر اميراً على جيشٍ أو سرية اوصاه في خاصته بتقوى الله وَمَن مَعَه من المسلمين خيرا، ثم قال: اغزوا باسم الله في سبيل الله قاتلوا من كفر بالله، اغزوا ولاتغلوا ولاتغدروا ولاتمثلوا، ولا تقتلوا وليداً، وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعُهُم إلى ثلاث خصال -أو خلال- فايتهن ما اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم:⇦

ڕۆستەم گوتی: ئەتۆی گەورەی مسوڵمانان؟ گوتی: نەء، بەڵام مسوڵمانان وەك یەك جەستە وان، ئەگەر گچكەترینیان یەكێك پەنا بدات بەرزترینیان لەقسەی دەرناچن‌و قسەی ناشكێنن، (هەڵبەتە بەمەرجێك دەرچوونی تێدا نەبێ لەفەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ).

دوایی ڕۆستەم لەگەڵ قسەبەدەست و پیاو ماقووڵانی گەلەكەی كۆبۆوەو گوتی: ئایا هەرگیز لەقسەی ئەم پیاوە بەرزترو تەواوترتان دیوە؟

گوتیان: پەنا بەخوا كە بەلای هیچ كام لە قسەكانی‌دا بچی‌و ئایینەكەی خۆت ولێ بێنی بۆ ئەم سەگە، ئەوە سەرنجی جل و بەرگەكەیت نەداوە؟

ڕۆستەم گوتی: خوا بتان گرێ تەماشای جل و بەرگ مەكەن، بەڵكو سەیری بیروڕاو وتو وێژو ڕەوشت وخوو بكەن، چونكە موسڵمان گرنگی بە بەرگ و كاڵاو خواردن نادەن و بایەخ بە ڕێزو حورمەت و سەربەرزی‌و مەردایەتی دەدەن و ڕەوشت و خوویان دەپارێزن...)[1].

لەم بەسەرهاتەشدا دەبینرێ كە مسوڵمانەكان بەئاشكرا بەگەلانی دنیایان ڕاگەیاندوە كە بەمەبەستی ڕاوو ڕووت و خەڵك ئازاردان و وڵات داگیركردن نەهاتوون، بەڵكو بەمەبەستی

---

ادعهم إلى الاسلام، فان اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم،... فإن هم ابوا فَسَلهُم الجِزيَة، فإن هم اجابوك فاقبل منهم وكف عنهم، فان هم ابوا فاستعن بلله وقاتلهم..) رواه مسلم، واتە: پێغەمبەری خواﷺ كاتێك فەرماندەیەكی بۆ سوپایەك یان بۆ كۆمەڵێك دیاری دەكرد، دەربارەی شەخسی خۆی ئامۆژگاری دەكرد بە پارێز لەخوا كردن و، سەبارەت بەو مسوڵمانانەش كە لەگەڵیدان بەچاكە كردن، پاشان دەیگوت: بەناوی خواو لەڕێی خوادا غەزا بكەن، لەگەڵ هەر كەسێكدا بجەنگن كە بڕوای بەخوا نیە، غەزا بكەن بەڵام دزی لەغەنیمەت مەكەن و (لەگەڵ دوژمنێكی پەیمان لەگەڵ بەستراودا) پەیمان مەشكێنن و جەستەی كوژراوانی دوژمن ناشیرین مەكەن، وەمنداڵان مەكوژن، وەهەركات بەرەنگاری دوژمنەكەت بووی لەهاوبەش پەرستەكان بانگیان بكە بۆ سێ شتان، جا هەر كامێكیانیان (لەو سێ شتە كە سەرپشكیان دەكەی بۆ هەڵبژاردن) لێ وەرگرتی لێیان قبووڵ بكەو وازیان لێبێنە؛ بانگیان بكە بۆ وەرگرتنی ئیسلام، جا ئەگەر وەڵامیان دایەوە لێیان قبوول بكەو وازیان لێبێنە،... بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوە داوای سەرانەیان لێبكە، جا ئەگەر ئەوان ڕازی بوون و وەڵامیان دایەوە لێیان وەربگرەو لێیان گەڕێ، بەڵام ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون ئەوە داوای یارمەتی لەخوا بكەو لەگەڵیان بجەنگە.

[1] بڕوانە: البداية والنهاية، بەرگی چوارەم، بەشی٧، ل٤٤، چاپی یەكەم؛ (الفتوحات الإسلامية)ی احمد بن زيني دحلان ، ب١؛ (تاريخ الأمم الاسلامية)ی شيخ محمد خضري بك، ب١، ل٢٠٧-٢٠٩.

ڕاگەیاندنی بەرنامەی خواو ڕووخاندنی کۆشکی تاغووت و سیتەمکاران و، ڕزگارکردنی چەوساوەو ستەمدیدەو هەژاران هاتوون، بەڵێ! دەریان بڕیوە کە بۆیە هاتوون؛ بەرنامەو پەیڕەوی خوا لەسەر زەوی بچەسپێنن و ئەو ئایین و ڕێچکەو بیرانەی کە چینایەتی و گەورەو بچووکی و قڕی و پڕی و ڕەوشت نزمی لەنێو خەڵکیدا دێننەدی و، ئینسانەکان دەکەنە کۆیلەو ژێردەستەو چەوساوە، تێکەوە بپێچرێن و فڕێ بدرێنە زبڵدانی مێژووەوە، وە دەریان بڕیوە کە بۆیە هاتوون، بەڵکو مرۆڤایەتی لەو جۆرە بیروبۆچوون و کونەڕەوانە ڕزگار بکەن کە بەهۆی تێڕوانینی هەڵەو ناتەواو بێسەروبەریانەوە ژیانی دنیا لەمرۆڤ تەنگ دەکەنەوە؛ لەنێو چوارچێوەیەکی تەسکی مادە پەرستی و بێ بڕوایی؛ یان نەتەوەپەرستی و بێ خوایی‌دا تەنگ بەمرۆڤ هەڵدەچنن و بەرەو کەندەڵان و هەڵدێری ڕەوشت نزمی و ئاژەڵ سیفەتی و دڕندایەتی دەیبەن.

جا برادەران!

ئەمەیە واقیعی مێژووی ئیسلامی و ئاوا هەواڵمان پێ دەدات سەبارەت بەهاتنی ئیسلام بۆ نێو گەلانی دنیا.

ئێستاش بەپێویستی دەزانم قسەیەکی زۆر سادەی مندااڵنەی ناحەزانی ئیسلام وەڕبخەینەوە، کە هەندێك مسوڵمانی سادەو حاڵی نەبوو، پێی فریودراون و لەخشتە براون، ئەو قسەیەش ئەوەیە کە گوایە ئیسلام بەزەبری شیروتیر بڵاوبۆتەوە، وە مسوڵمانەکان کە هاتوون تووشی هەر کەسێك بووبن پێیان گوتوە مسوڵمان بە! جا ئەگەر مسوڵمان بووبێ ئەوە زۆر چاکەو خوا بتحەسێنێتەوە! خۆ ئەگەر مسوڵمان نەبووبێ و سەرەخەری کردبێ ئەوە هێندەی دەڵێی: یەك و دوو سەریان پەڕاندوەو ملیان هەڵبڕیوە!!

بەڵام لەڕاستی‌دا ئەم قسەیە دەعوایەکی بێ شایەدەو لەدنیای بەڵگاندا بێ‌پشت و پەنایە... چونکە یەکێك لە بەڵگەنەویستەکانی ئیسلام ئەوەیە کە عەقیدەو بڕوایەك لەسەر بنچینەی قەناعەتی ئینسان و بەویست و ئیرادەی خۆی نەبێت وەرناگیرێ و بایەخی نیە، وەك خوای قسەلەجێ فەرموویەتی ﴿لا إكراهَ في الدينِ قد تبينَ الرشدُ منَ الغي..﴾ البقرة (٢٥٦)، واتە:

لەوەرگرتن و شوێنکەوتنی ئاییندا زۆرە ملیّو تۆبزی کردن نیە، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت لێك جویّ بوونەتەوە[1]

ئەوە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە وەك مێژوو هەواڵی پیّداوین، تەنها کاتێك مسوڵمانان پەنایان بردۆتە بەر چەك، کە ئەو گەلەی لەگەڵی ڕووبەڕوو بوونەتەوە نەمسوڵمان بووبن، وەنەرێگەیان دابیّ ڕاگەیاندنی ئیسلام -کە لەنەدانی سەرانەدا خۆی دەنوێنیّ- ئەو کاتەش مسوڵمانان ناچار بوو ون دەست بدەنە چەك، بەڵام نەك بۆ بەزۆر مسوڵمان کردنی خەڵکی - چونکە تۆبزی کردن لەوەرگرتنی ئاین دا نیە- بەڵکو بەمەبەستی لابردنی ئەو زۆردارو خاوەن بەرژەوەندیانەی کە لەڕێی ئیسلامدا بوونەتە پەرچ و تانەو، وەك ئەو گاشە بەردەیان لیّهاتوە کە دەکەوێتە نێو کانیاوێکەوەو نە بۆخۆی دەخواتەوەو، نە ڕیّ بەخەڵکیش دەدات بخۆنەوە، هەڵبەتە لابردن و فڕیّدانی ئەو گاشە بەردە، کورد گوتەنی: لەشەو نوێژان پێویست ترە، بەڵیّ ئیسلام هێزی خستە کار بۆ ئەوەی بەدنیادا بڵاو بێتەوەو بچێتە بەر چاوو دڵی خەڵکی، جا ئەو دەمی کیّ بەویست و خواستی خۆی هەڵی بژارد زۆر چاکەو کێش پیّی ڕازی نەبوو، کەس بۆی نیە هەر خۆشی لیّ سوور کاتەوە، هەتا وەکوشتن و تۆبزی لیّکردن ڕادەگات!!

...ڕەنگە یەکێك بپرسێت، جا خۆ براله ئەو گەلانەی مسوڵمانەکان لەگەڵیان بەشەڕ دەهاتن هەر ئەوانە بوون کەئاییینی ئیسلامیان نەدەویست، شەڕ لەگەڵ کردنەکەشیان چاکترین بەڵگەی پیّ قایل نەبوون و نەویستنەکەیان بووە، مادام وابیّ چۆن دەڵیّ: مسوڵمانەکان بەنیازی خەڵك مسوڵمان کردنەوە نەجەنگیون؟!!

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەم ڕەخنەیە کاتێك جیّی خۆی دەگرێت کە ئەو کەسانەی لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگیون، یەکەم: هەر کامێکیان بیّ زۆرە ملیّو چاو زەق کردن و هەڕەشەو گوڕەشە

[1] لێرەدا جیّی سەرنج ئەوەیە، کە دوا بەدوای ﴿لا إكراه في الدين﴾ گوتراوە: ﴿قد تبين الرشد من الغي﴾. لەمەوە دەفامرێتەوە کە پاش ڕاگەیاندنی ئاین تۆبزی کردن نیە، چەمکی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة)ی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنیّ، کە بەر لەڕاگەیاندنی ئاین تۆبزی کردن هەبیّ، ئاشکراشە کە بەکارهێنانی هێزو تۆبزی کردن لەودەمیدا ڕەوایە، بەڵام نەك بۆ باوەڕ پیّهێنان، بەڵکو بۆ لابردنی ئەو تاغووت و زاڵمانەی کە بونەتە تانەو چەپەرو لەمپەر لەڕێی بڵاوبوونەوەو ڕاگەیاندنی ئیسلامدا، واتە هێز بۆ ڕاوەستان لەبەرانبەر هێزو دەستەڵاتی کوفرو شیرکدا کە ڕێی بیرکردنەوەی ئازادو بڕواهێنان بەخواو بەرنامەکەی لەخەڵکی دەگریّ.

هاتبێتە کۆڕی جەنگەوە، دیارە ئەوەش وا نەبووەو حوکمڕان و میری هەر نارچەیەك نوێنەری هەموو خەڵکەکە بووەو هیچ کەس لەئاقاریدا سەری پێوە نەبووەو خاوەنی ویست و قسەی خۆی نوبووەو کورد گوتەنی: کەس زاتی نەکردوە بڵێ لەل!

بێگومان شتێکی ڕوونیشە کە بابای سەرۆك و میر، بەس لەگۆشەنیگای تەسکی بەرژەوەندی خۆیەوە دەڕوانێتە شتان، هەموو دەمێش بەرژەوەندی میرێکی خۆسەپێن و بەزەبر و زۆر لەوەدایە کە بارودۆخ هەر وەك خۆی بمێنێتەوەو بۆ موتفەڕکیش نەختێك لەو ئیسلامە نەیەتە نێو گەل، کە لەبەنزین بەکارترە بۆ هەڵایساندنی ئاگری شۆڕش دژی باروودۆخی نالەبارو ڕەپێچەکدانی ڕژێمی پڕ ستەم و چەوساندنەوەو خراپەو ئاشووبی دوور لەخوا[1].

دووەم: کە هەر کامێکیان لەکاکڵ و نێوەڕۆکی ئیسلام تێگەیبن وبزانن چییەو چۆنە، دیارە ئەمەش دیسان نەهاتۆتە دی، کەواتە ئەو گەلە چەوساوە کاتێك لەگەڵ سوپای ئیسلام دا

---

[1] بەڕاستی هەر جارێك بەسەرهاتی یەکێك لەو جەنگانەم دێتە بەرچاو کە لەنێوان هێزی ئیسلام و دانیشتوانی ئەو وڵاتانەدا ڕووی داوە کەویستوویانە ڕووناکی ئیسلامی بگەیننە نێو، خامەی زەین و بیرم تابلۆیەکی بەم شێوەیە لەسەر ڕووپەڕی خەیاڵم دەنەخشێنێ:

وام دێتە بەرچاوان کە کۆمەڵە پزیشکێکی زۆر دڵسۆز کۆڵێك دەرمان و پێداویستییەکانی پزیشکییەوە دەیانەوێ بچنە نێو شارێکەوە کە دانیشتوانی دووچاری چەندان دەردو نەخۆشی کوشندە هاتوون، بەڵام دزو جەردەو ڕێگر لەسەر دەروازەی ئەو شارە دانیشتوون و گەلێك لە نەخۆش و دەردەدارەکانیشیان بە بێگار هێناوە، بەبیانووی ئەوەی گوایە بەرگری لەبەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەن، چونکە دەزانن بەهاتنی ئەو پزیشك و حەکیمانە چارەسەری دەردو نەخۆشی خەڵکەکە دەکرێو بەوەش دەرفەتی چەوساندنەوەی خەڵکەکەیان لەقیس دەچێ، بەڵگەی ڕاست و دروستی ئەم وێچواندنەشم ئەوەیە کە بەدرێژایی مێژووی ئاین، خەڵکی لەئاقار ئاییندا دوو بەرەیان پێك هێناوە، یەکەم: بەرەی ڕەش و ڕووت و چەوسێنراوەکان، کە بوو ون بە هەڵگری ئاڵاو مەشخەڵی ئاین و پشت و پەنای؛ دووەم: بەرەی زۆردارو چەوسێنەران، کە بوو ونە چەپەرو کۆسپ و بەربینگیان بەئاین و شوێنکەوتوانی گرتووە، لەقوڕئانی بەڕێزیش دا زۆر جاران وشەی (المستضعف) واتە، چەوسێنراوەو (المستکبر) واتە: چەوسێنەرو خۆبەزلزان و (المترف) واتە: خۆشگوزەران، بەکارهێنراون.

هەڵبەتە زاراوەی (المستضعف) درووشم و عینوانی بەرەی هەڵگری ئایینەو، زاراوەی (السمتکبر) و (المترف)یش درووشمی بەرەی کوفرو دوژمانی ئایینە، خوای دادگەر لەو بارەوە فەرموویەتی ﴿وما أرسلنا في قرية من نذير إلا قال مترفوها إنا بما أرسلتم به كافرون﴾ السبأ (٣٤).

جەنگاوە، بۆیە نەجەنگیوە کە پێشگیری لە بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی بەرنامەی خوا بکات، چونکە وەك گوتمان ئەو بەرنامەی ناوبراوی نەناسیوە، بەڵکو بۆیە شەڕی کردوە تاکو پێشگیری لەو ئیسلامە درێوو ناقۆڵایە بکات کە دامو دەزگای پڕوپاگەندەی ئاغاو میرو زۆردارو تاغووتە خاوەن بەرژەوەندی‌یەکان، لەتابلۆی ئالەباردا ڕایان دەنواندو لەبەر چاوانیان دەبێزاند، بەڵێ ئەو گەلە کە لەگەڵ لەشکرو سوپای ئیسلامدا بەشەڕ هاتوە، لەبەر ئەوە نەبووە کە لەو ئیسلامە حاڵی بووەو، چونکە لێی حاڵی بووە بۆیە دەستەو یەخەی بووە، نا، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەو گەلە لەڕاستیدا لەگەڵ تارمایی‌یەکدا جەنگیوە کە دامو دەزگای زۆردارەکان لەبەر چاوی ڕایان نواندوە، بەواتایەکی دیکە، بۆیە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا جەنگیوە چونکە لەنیازی پاك ومسوڵمانانەیان نەگەیوەو ستەمکارو خاوەن بەرژەوەندیو ئەشرافە ناشەریفەکان پڕوپاگەندەیان بۆ کردوەو بەسەهوویان بردوە[1].

... مەسەلەی فریودرانی کوردانیش لەلایەن مسوڵمانانی هەوەڵەوە، کاتێك وەڕاست دەگەڕێ کە ئیسلام بیروباوەڕێکی بێ خێرو بەرەبێ، بەڵام کەسێك خەڵکی بانگ بکات بۆ بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست و پڕ خێرو بەرەکەت، پێی ناگوترێ خەڵك فریودەرو هەڵخەڵەتێنەر، بەڵکو پێی دەگوترێ پێشەواو ڕێ نیشاندەر.

... مەسەلەی خۆ لەسەر گەل کردنە ڕابەرو پێشەواش، ئەگەر بەنیازی ڕوونکردنەوەی ئیسلامەوە بووبێ، ئەوە شتێك نیە پێویست بکات لەسەری قەڵس و تووڕە بین، بەڵکو دەبێ بڵێین: خوا پاداشتیان بداتەوە، خۆ ئەگەر بەنیازی چەوساندنەوەشەوە بووبێ ئەوە، یەکەم: لە مسوڵمانە ڕەسەنەکانی هەوەڵی‌دا ڕووی نەداوە، وەك مێژوو هەواڵی پێداوین، دووەم: کە لەدوایی‌دا هاتۆتەدی، بەلادان و لاملی لەئیسلام دادەنرێو هیچ ماقووڵێش نیە ئیسلام بەشتێك تاوانبار بکرێ کە پێی قایل نیەو پێشگیری لێکردوە.

ئەوە بەکورتی هەڵسەنگاندنی ڕەخنەی یەك بوو!!

---

[1] پێویستە بگوترێ کە ئەو کاتەش کوردستان بەشێکی لەژێر ڕکێفی ساسانی‌یەکان و بەشەکەی دیکەشی لەژێر ڕکێفی بیزەنتی‌یەکان بووەو گەلی کورد لەژێر دەستی ڕۆم و فارس دابووەو بەفیت و فەرمانی ئەو دوو دەوڵەتە زلهێزو چەوسێنەرە شەڕیان لەگەڵ سوپای ئیسلامدا کردوە، نەك بەویستی ئازادی خۆیان، وە بەرگریشیان لەبەرژەوەندی‌یەکانی ئەوان وکیانی ئەوان کردوە نەك ئی خۆیان.

# وەڵام دانەوەی ڕەخنەی دووەم

سەبارەت بەشی دووەمیشیان دەڵێن:

١- مسوڵمانەکانی هەوەڵی -کە زۆربەیان هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بوون- ئەو داب و دەستوورو عادات و نەریتانەی کە بەنێو ئەو گەلانەدا بڵاویان دەکردنەوە، کە ئاپینی ئیسلامیان قبووڵ دەکرد، نەبەمیرات لە باپیریانەوە بۆیان مابوونەوە، نەلەگیرفانی خۆشیان دەریان هێنابوو، بەڵکو ئەوان دوای ئەوەی ئیسلامیان وەرگرت، ئیسلامێك کە سەرلەبەری ژیانیانی گۆڕی‌و لەجلیتاوو زەلکاوی نەفامی دەری هێنان، ڕێو شوێن و خوو خدەو نەریتەکانی خۆشیان فڕێ داو وازلێهێنا.

بەڵێ عارەبە مسوڵمانەکان یاساو دەستوورو ڕەوشت و خووی ئیسلامەتی بوو ڕایان دەگەیاند نەك داب و دەستووری نەتەوایەتی عارەبان، لەمەوە دەگەینە یەك ئەنجامی فرە بایەخ دار، ئەویش ئەوەیە کە وەرگرتنی داب و دەستوورو ڕەوشت و خووی ئیسلامەتی دیاردەیەکی تاپۆکراو نیە لەسەر گەلی کورد، تاکو بەکێشان و پێوانەیەکی ڕەگەزپەرستانە لێك بدرێتەوە، بەڵکو دیاردەیەکە هەموو گەلە مسوڵمانەکان تێیدا بەشدارن.

٢- سەبارەت بە بڵاوبوونەوەو پەرەستاندنی ئەدەب و زمان و کەلەپووری عارەبیش لەنێو کوردو گەلانی دیکەشدا دەڵێن:

(أ) شتێکی بەڵگە نەویستە کە لەجیهاندا تاقە یەك زمانیش نیە توانیبیەتی سەرو سیماو بیچمی نەتەوایەتی خۆی بپارێزێ‌و هیچ جۆرە وشەو زاراوەیەکی بیانی ئاوێتە نەبووبێ‌و ڕەگەڵ نەکەوتبێ، سوێندی ئەو تیرەو هۆزانە ناخۆم کەلە ژیار (حضارة)ی مرۆڤایەتی خۆیان دوورە پەرێز گرتوەو کەنارگیر بوو ون و، لە قاوغ و قەپێلکی خۆیاندا خۆیان ڕێك هیناوە.

تێکەڵ بوونی وشەو زاراوەی ئیسلامیش لەگەڵ زمانی کوردی‌و زمانی گەلانی دیکەشدا شتێکی ئاسایی‌و سرووشتی‌یەو هیچ حەوجێ بەوەی ناکات لەخۆوە گومانی خراپ بەرین و تەئویلی لاوەکی‌و بێ‌ڕێو جێی بۆ بێنینەوە.

ئەمە لەسەرێکەوە، لەسەرێکی دیکەشەوە، هیچ زمان بەوە پەکیان نەکەوتوەو گورگیان دەمەڕێ نەکەوتوە، کەوشەو زاراوەی بیانی‌یان ڕەگەڵ کەوتوون، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم دیاردەیە هۆی دەوڵەمەند بوون و پێنج گرتن و فراژوو بوونی زمانانە، بۆ وێنە: ئایا زمانی

کوردی بەبەکار هێنانی وشەی: تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، کۆمپیوتەر، ئۆتۆمۆ بیل، پەنکی کەوتوەو نەدار بووە یان بەپێچەوانەوە؟!

(ب) ئیسلامەتی بەهیچ جۆرێك دژایەتی لەگەڵ زمان و ئەدەب و هونەرو کەلەپووری هیچ گەلێك دا نیە، چونکە لەڕوانگەی ئیسلامەوە هەموو تیرەو گەلەکان یەکسانن و هیچیان ئیمتیازو زیادی‌یان نیە بەسەر هیچیاندا.

پەروەردگاریش فەرموویەتی ﴿ياأيها الناس إنا خَلَقناكُم مِن ذَكَرٍ وانثى وَجَعَلناكُم شُعوباً وَقبائل لِتَعارَفوا. إن اكرَمَكم عِندَ الله اتقاكم إن الله عليم خبير﴾ الحجرات (١٣)، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لەنێرو مێ‌یەك دروست کردوەو کردوومانن بە کۆمەڵە گەلْ وتیرەیەك، بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، ئەوەشتان لەلای خوا بەڕێز ترە کەتەقوای پترە، بێگومان خواش زاناو شارەزایە.

## وەڵامی ڕەخنەی سێیەم

لەبابەت خاڵی سێیەمیشەوە خستنەڕووی چەند ڕاستی‌یەك پێویستە:

١- لاڕێ بوون و هەڵەبوون (انحراف) لەبیروباوەڕ دیاردەیەکی تەرخان کراو نیە لەسەر ئایینی ئیسلام و کاڵایەك نیە بەس بەباڵای وی بڕابێت، بەڵکو خوای میهرەبان لەوەتی دنیای داناوەو ئادەمی لەسەر ڕۆناوە، پەیتا پەیتا بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی بەفریشتاندا بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانە کردوون و ڕێنموونی کردوون، بەڵام شەیتان و تاغووتەکان چاویان بەرینایی نەداوە مرۆڤەکان وا بەبەختیاری‌و ئاسوودەیی بیگوزەرێنن و لەبن سێبەری درەختی سەر بەخێرو پڕ پیت و پێزی بەرنامەی خوادا ژیانێکی ئینسانانە بەرنەسەر.

بۆیە بەهەموو شێوەیەك لێیان خەفتاون و کوێرە ڕێی سەر لێ شێوێن و ڕێچکەی دەستکردیان بۆ ڕانواندوون و، سلسلەو پلپلەی سەرنج ڕاکێشان پێ خستوون و، ناوی زل زل و درووشمی قەبە قەبەیان بۆ داناون، تاکو سەرەنجام ژمارەیەکیان لێ خشتە بردوون و تووشی چۆرتمی‌یان کردوون.

٢- هەرچەندە سۆفیایەتی (التصوف)[1] لەبنەڕەت دا ڕیشەو بنەمایەكی ئیسلامی هەیەو، كەس ناتوانێ بڵێ ئیسلام لێی بەرییە، بەڵام وێڕای ئەمەش پێویستە چەند شتێك بزانرێن:

(أ) سۆفیایەتی ئەگەر بەو چاوە سەیر بكرێت، كە بەرنامەیەكی سەربەخۆی سەرلەبەری ژیانەو، وەك ڕێچكەیەك لەڕاست ئیسلامدا خۆی دەنوێنێ، ئەوە ئەم جۆرە سۆفیایەتی‌یە كەم و زۆر پەیوەندی بەئیسلامەوە نیە، چونكە خوای بێ‌هاوتا بەس یەك جۆرە ئیسلامی ناردوە نەك دووسێ‌یەك!

(ب) بەڵام ئەگەر سۆفیایەتی وا سەیر بكرێ، كە بریتیە لە پەروەردە كردن و پاككردنەوەی دڵ و دەروون و مشت ومال كردنی گیان و دوورخستنەوەی ئینسان لەخەسڵەتە نالەبارە شەیتانی‌یەكان، وەك نەزانی، دڵ ڕەقی، فیزو دەمار، خۆ ڕەپێش كردن، ئرۆزنی، دەغەڵی، ڕیایازی، بێ‌پەیمانی، ڕژدی، توڕەیی، ڕق و قین، ئێرەیی، خۆدەرخستن، تەنبەڵی، دنیا دۆستی، تەماعكاری، ترسنۆكی،.... و ڕازاندنەوەی بەخەسڵەتە جوان و پەسندەكانی وەك: زانایی، دڵ نەرمی، خۆبەكەمگرتن، دڵپاكی، بەرچاو فراوانی، مەندی، دنیا نەویستی، ڕاست گۆیی، دڵسۆزی، بەجەرگی، بەخشندەیی،... بەكورتی ئەگەر وا سەیری سۆفیایەتی بكرێ، كە بریتی‌یە لەلایەنی خۆ سافكردنەوەو ئاكار پەسەندی، ئەوە شتێكی ڕەسەنەو زۆر پەسەندو دڵگیریشە.

چونكە هەروەك چۆن زانیاری شەرع (علم الفقه) لەئەنجامی وردبوونەوەو لێكۆڵینەوەی زانایانی ئیسلام لەبابەت ئەو دەقانەوە پەیدابووە كە پەیوەندی‌یان بەهەڵس و كەوتە ڕواڵەتی‌یەكانی مرۆڤەوە هەیە، جا چ لەبورای تاكی‌داو چ لەبورای كۆمەڵدا، زانیاری سۆفیایەتی (علم التصوف)یش بە هەمان پێودان لەئەنجامی توێژینەوەو قووڵ بوونەوەی زانایانەوە لەبابەت ئەو ئایەت و فەرمایشتانەوە كە پەیوەندی‌یان بەلایەنی مەعنەوی‌و ئەخلاقی‌و خەسڵەتە شێرراوەو دەروونی‌یەكانی مرۆڤەوە هەیە سەری هەڵداوە.

(ج) ئەو جۆرە سۆفیایەتی‌یەی لەسەردەمی ئێمەدا هەیە، دووری لەسۆفیایەتی ڕاستەقینە، وەك دووری مسوڵمانەتی ئێمەیە لە مسوڵمانەتی ڕەسەن و ڕاستە قینە.

---

[1] لەهەر كام لەكتێبی (مسوڵمانی كامڵ) بەشی یەكەم و، كتێبی (ڕێگای صالح بوون)دا مەسەلەی تەریقەت و تەصەووف توێژراوەتەوەو، لەئێرە چاكترو فراوان تر هەڵسەنگێنراوە، سەرنجیان بدە.

بەڵێ! سۆفیایەتیش وەك زۆربەی لایەنەكانی تری ئیسلام شاخ و باڵی زیادو شتی ئەفسانەی زیادەی بیرو زەینی ئینسانی ڕەگەڵ كەوتوەو، ئەو جوانیو ڕەونەق و كاریگەرییەی پێشووی نەماوەو لەنێو چوارچێوەیەكی تەسكی لە كەشكۆڵ و دەف و تەپڵ و شاڵ و تەسبێح و زەرگ و شیرو نركە نرك و شیراندن و هەڵپەڕین و سەما... دروست كراودا، حەپس كراوەو تەنگی پێ هەڵچنراوەو، كە جاران مایەی هاتنە خواری بەزەییو پیت و پیزی خواو خاوێن كردنەوەی دەروونان و زیندوو كردنەیوەی دڵان و هۆشیار كردنەوەی بیرو زەینان و شیرین كردنی ئیسلامەتی بوو لەكن خەڵكی، ئێستا مەگەر چۆنەكایی دەنا بەپێەوانەوە مایەی داباریینی تووڕەیی خواو مراندن و هەڵگێڕانەوەی دڵان و بەنج كردن و كوێر كردنەوەی بیرو هۆشان و تاڵ كردنی ئیسلامەتییەو بۆتە چاكترین هۆو ئامرازی خۆ پێ ژیاندن و خەڵك فریودان، سەربارەی هەموو شتانیش ناحەزو دوژمنانی ئیسلام لە جەنگەڵ و چخوردی سۆفیایەتی بێ سەرەو بەرەدا بیانووی پلارو توانجی چاكیان دەست دەكەوێ كە بە ناهەق بیگرنە ئیسلامی تێرو تەواوو بێ لەكە.

٣- سۆفیایەتی وەك هەر لایەنێكی تری ئیسلام ئەگەر بەڕێك و پێكی بەڕێوە ببرێو وەك لایەنێك لەئیسلام دابنرێ كەلایەنی تەزكیەو ئەخلاقەو، دەغەڵ و مەغەڵ و شتی بێ ڕەێو جێو سەیرو سەمەرەی ڕەگەڵ نەخرێو بەڕێچكەو شێوازێكی سەربەخۆو تایبەتی دانەنرێ، زۆر كاریگەرو سوود بەخش دەبێو لەدڵی هەموو مسوڵمانێكی تێگەیشتووشدا جێی خۆی دەگرێو، نەك هەر نابێتە گیاكەڵەو چەكی دەستی زۆرداران و گەلی پێ فریو نادرێ، بەڵكو دەبێتە هۆی چەسپاندنی خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺ و بڵاوكردنەوەی تەباییو برایەتیو ڕەوشت بەرزیو هەڵبژاردنی دواڕۆژ بەسەر دنیاداو ڕازی نەبوون بەژێر دەستەییو مل نەدان بۆ كۆیلەییو زەبوونی...

ئینجا هیچ كەسیش نكوڵی لەوە نیە كە گەلێك جاران كەسانێكی دین فرۆش لەبەرگی شێخایەتیو مەلایەتیدا بوو ون و ئێستاش هەن دەبن بەچەكی دەستی زۆردارو ملهوڕان بەهۆی چاوبەست كردنی خەڵكیو بەسەهوو بردنیانەوە!

بەڵێ برادەران!

ئێمەش زۆر چاك دەزانین و مێژووش بەختەتی درشت نووسیویەتی كەچەندان جار شێخ و مەلای بەناو پێشەوای ئایینی ئەوتۆ هەبوو ون كە لەپێناوی پارووی چەورو نەرم و جێگەی

خۆش و گەرم و بەرژەوەندی شەخسی و بنەماڵەیی خۆیاندا فتوای هەڵەو ناتەواویان بۆ دەستەڵاتدارە زۆردارەکان داوەو قسەو هەڵوێست و، ڕەفتارە ناشەرعی‌یەکانیان بەزەبری تەحریف و تەئویل و تەئویلکاری و فێڵە شەرعی سەیرو سەمەرە، بۆ ڕەشەرع خستوون.

وەبەناوی ئایینەوە گەلێك قسەو پەندی وایان لە گوێی خەڵکی چکاندوە، کە لەژەهرو ملەو گیاکەڵە پیس تر بوو ون، بۆ زەبوونی قبووڵ کردنی خەڵك و بڵاوبوونەوەی گیانی ترسنۆکی و مراندنی دەماری مەردایەتی و عیززەتیان، بۆ وێنە: سەرۆك و پادشای وڵات هەرچەندە زۆرداریش بێ، فەرمانبەریی هەر فەرزە.

"نانی کێت خوراد، سەڵەواتی لەدیداری لێ بدە"!

"دەستەڵاتدار خوای سەر عەرزی‌یە"!

ئینجا بەدەردی پێشینان دەڵێن (گەورە دەڵێن لەبنەبانان گچکە دەڵێن لەسەربانان)، خەڵکی عەوامیش کە ئەم جۆرە هەڵوێستانەیان لەو جۆرە بەناو ڕابەرو پێشەوایانە دیوەو، ئەم جۆرە قسەو پەندانەیان لێ بیستوون، ئەوانیش چەند قسەو پەندێکی دیکەی هەڵەیان لەو بارەوە داڕشتوە، بۆ وێنە:

"ئەو دەستەی نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم".

"ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە".

"هەرکەسە دەست بە کڵاوی خۆی بگرێت با نەیبات".

بەڵێ براداران!

ئەم جۆرە قسەو هەڵوێستە نائیسلامی‌یە بەزیوانە لە کەسانێکی بەڕواڵەت زاناو بەناو پێشەوای ئاییندا بیستراون و بیتراون و ئێستاش دەبیسترێن و دەبینرێن، بەڵام:

یەك: ئایا ئیسلام بەو جۆرە هەڵوێست و ڕفتارانە ڕازی‌یە؟! ئایا کاکڵی ئیسلام بریتی نیە لەخوا بەیەکگرتن(التوحید)و جگە لەخوا هیچ کەسی دیکە بەخوا دانەنان (لااله الا الله)؟! وە ئایا پێغەمبەری پێشەوا ﷺ نەیفەرموە (أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر) رواه النسائي، واتە: چاکترین جۆری جیهاد گرتنی قسەیەکی هەقە لەلای دەستەلاتداری زۆردار؟! وە ئایا نەیفەرموە (سيكون أمراء فسقةٌ جورةٌ فمن صدقهم بكذبهم وأعانهم على ظلمهم فليس مني ولست منه ولايرد على الحوض) رواه النسائي والترمذي وأحمد، واتە: لەداهاتوودا چەند کاربەدەستێکی تاوانبارو ستەمکار دێنە سەر کار، جا هەر کەسێك شایەتی بۆ درۆکانیان بداو

ئۆباڵیان بۆ بکێشیٚ و، لەسەر ستەم و زۆریان یاریدەیان بدات، نە لەمنەو نە مـن لـەویم و نـە دەچێتە سەر گۆلاو –ی کەوسەر– یش!

دوو: ئایا ئیسلام بێجگـە لـەو جۆرە بـەناو پێشـەوا دنیادۆسـت و هەڵپەرسـت و ترسـنۆکانە کەسی دیکـە شـك نابات؟!! ئایا مێـژوو هـەروەك چۆن هەڵوێسـتی نامسـوڵمانانەو بەزیوانـەی ئەوانەی تۆمار کردوە، هەڵوێستی مسوڵمانانەومەردانەی زۆر لە پێشەواو ڕابەرانی ڕاستەقینەی ئیسلامی تۆمار نەکردوە؟!! کە ئیستا بۆ نموونە بڕێکیان لێ دەخینەڕوو:

## هەڵوێستی مەردانەی هەندێك لەزانایانی ڕەسەنی ئیسلام

١– ابو مسلم الخَولاني:

کـەڕەتێکی (ئـەبوو موسـلیم) لـە ڕۆژی جومعـەدا، لـەکاتێکدا (معاویـة) – کـە فـەرمانڕەوای دەوڵـەتی ئیسلامی بـوو– وتـاری دەخوێنـدەوە لێی ڕاست بـۆوەو پـیٚ ی گـوت: ئـەی موعاویـە! نەگوێت بۆ دەگرین و نەفەرمانبەرییت دەکەین، موعاویە گوتی: بۆچی؟!

گوتـی: لەبەرچی مووچـە (معـاش) لـە خـەڵکی دەگریـەوە، خۆ نـە ئـی خۆتـەو نـە ئـی دایـك وبابتە؟!!

٢– شیخ عبدالقادر الجیلاني:

ڕۆژێکـی شـێخ عـەبدولقادری گـەیلانی خـوا لێی خـۆش بـیٚ، چـۆ سـەر دوانگـە (منـبر)و سەرزەنشـتی خەلیفەی ئەو سەردەمە (المقتفي بالله)ی کرد، لەسەر ئەوەی کە (ابـن مزاحـم)ی زۆرداری کردبوو بە والی و پـیٚ ی گـوت: یـەکێکت لەسـەر مسـوڵمانان کردۆتـە گـەورە لەهـەموو زۆرداران زۆردارترە، بەیانی وەڵامت چ دەبیٚ لەکن خوای بەرزو بیٚ هاوەل؟!

دوای ئەوە خەلیفە وەك بی نێو ئاویٚ لەرزیو والی ناوبراوی لیٚ خست!!

٣– العز ابن عبدالسلام:

ئەم زانا لەخواترسە شۆڕشگێڕە لەساڵی (٦٣٨)ی کۆچی‌دا، لە کاتێکدا (ملك اسماعیل) لە (نجم الدین بن ایوب) حاکمی میسر ترساو لەگەڵ خاچ پەرستەکان ڕێك کەوت و کاکەو براڵەی خۆیان کردو، قەڵای (صفد)و دەوروبەرەکەی و قەڵای (الشقیف)و نیوەی (صیداو طبریةو جبل

عامل)ی[1] دانی، کەچەند شوێنێکی زۆر ستراتیژیو گرنگ بوون، تا ئەوانیش لەجیاتیان دژی (نجم الدين بن ايوب) کۆمەکی پێ بکەن.

لەو کاتەدا (العز بن عبد السلام) هەر بەوەندە وازی نەهێنا کە دژی ئەو ڕەفتارە خۆفرۆشانەیەی (ملك اسماعيل) فتوای داو بەشتێکی نائیسلامیانەی لەقەڵەم دا، بەڵکو لە وتاری ڕۆژی جومعەشدا سەرزەنشتی کردو مۆری خیانەت و ناپاکی پێوەناو دەری خست کەچەند کارێکی ناڕەوایەو مەترسی هەیە بۆ سەر ئۆممەتی ئیسلامی.

٤- احمد بن تيمة الحراني[2] :

کاتێك لە کۆتای ساڵی (٦٩٨)ی کۆچیدا، هەواڵی هێرشی (غازان)ی تەتەری لەئێرانەوە بەرەو (حەڵەب) گەیشت و لە (٢٧ی ربيع الاول ٦٩٩)دا جەنگێکی گەرم لەنێوان سوپای غازان و سوپای (ناصر)دا -کە والی دیمەشق بوو- ڕوویدا، وە لەئاکامدا ناصر تێك شکاو بەدیمەشقیشەوە نەگیرایەوە، بەدوای ویش دا میرو کاربەدەستە زلەکانی نارچەکە چوون بۆ میسرێ، لەو کاتە ناسك و دژوارەدا (ابن تيمية) لەگەڵ خەڵکەکەدا وەك قەڵایەکی پۆڵایین ڕاوەستاو لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوون بۆ دیتنی غازان و وتو وێژێکی توندو تیژ لەنێوان غازان و(ابن تيميه)دا ڕوویدا، لەو وتو وێژەدا (ابن تيمية) بە غازانی گوت:

(پێت وایە مسوڵمانیو قازیو شێخ و بانگ بێژت لەگەڵ دانەو کەچی هاتوویە سەرمان وڵاتمان داگیر دەکەی؟! باب و باپیرانیشت لەگەڵ ئەوەش دا کەکافر بوون، دوای پەیمان بەستن وڵاتیان داگیر نەدەکرد، بەڵام تۆ پەیمانت شکاندو، قسەت کرد کەچی درۆت کردو نەتبردە سەرێ)

ئینجا کاتێك دەمی نان خواردنێ هات، غازان داوای لێ کردن کە نانی بخۆن، هەموویان خواردیان جگە لە (ابن تيمية)، جا کاتێك کە لێیان پرسی بۆچی ناخۆی؟!

---

[1] کەچەند ناوچەیەکن لە وڵاتی شامێ.

[2] جێی داخ و خەفەتە کە لەلایەن بەشێك لەمەلاو شێخانی کوردستانەوە بەخۆڕاییو بە نەزانانە هێرشی ناڕەوا دەکرێتە سەر (ابن تيمية)و خەڵکێکی زۆر لەبەرهەم و کەلەپووری ڕەسەنی ئەو کەڵە زانایە بێبەش بووە!!

فەرمووی: چۆن خواردنێك بخۆم كە هەمووی مەڕو ماڵاتی خەڵكی هەژارە تاڵان كراوەو بەئاگری دارێك كوڵاندوویانە كە بەزۆر لەخەڵكتان ئەستاندوە!!

غازانیش بۆ هەموو ئەو قسانە گوێی ڕاگرتبوو و چاوی بڕیبوو (ابن تیمیة)و ڕووی لێ وەرنەدەگێڕا، ئینجا غازان پرسی: ئەم زاتە كێیە؟! كەسم ئاوا نەدیوە هێندە بەجەرگ و هێندە قسە كاریگەر لە دڵاندا، وە بۆ هیچ كەس هێندە گەردن كەچیم نەنوادوە؟!

كاتێك هەواڵیان پێدا كێیەو چییەو چۆنە، داوای كرد كە بۆی بپاڕێتەوە، ئەویش بەم جۆرە دەستی كرد بە پاڕانەوە:

خوایە گیان! ئەگەر ئەم بەندەیەت -واتە غازان- بۆیە دەجەنگێ تا بەرنامەی تۆو ئاڵای تۆ بەرز بكاتەوەو خەڵك تەنها پابەندی ئایینی تۆ بن، خوایە سەری بخەیو بیكەی بەخاوەن دەسەڵات، بەڵام ئەگەر بۆ خۆ دەرخستن و ڕیاكاریو دنیاپەرستیو بەرز كردنەوەی ناوی خۆیو ژێر دەست كردنی ئیسلام و شوێنكەوتووانی دەجەنگێ، یاخوا بیگرییو تێكی بشكێنیو دوای بڕی!!

غازانیش لێكدا لێكدا دەیگوت: ئامین، هەردوو دەستیشی بەرز كردبوونەوە.

ئینجا كاتێك چوونە دەرێ (قاضي القضاة) كە وا پێدەچێ یەكێك بووبێ لە مەلا دین فرۆشەكانی ئەو سەردەمە بە (ابن تیمیة)ی گوت: خەریك بوو سەرمان بەفەتارەت بدەی! بەخودا ئێمە چیدی هاوڕێیەتیت ناكەین و لەگەڵت بەڕێیەدا ناڕۆین، (ابن تیمیة)ش فەرمووی: بەخودا دەنا منیش حەز بەهاوڕێیەتیتان ناكەم، بەم جۆرە (قاضی القضاة) لەگەڵ پێڕەكەیدا ڕۆیشتن و (ابن تیمیة)و بڕێك لەبرادەرانیشی مانەوە، دوایی كە میرو پیاوە قسە ڕۆیشتووەكانی غازان هەواڵی (ابن تیمیة)یان بیست، هاتنەلایو داوای دوعای خێریان لێكردو (٣٠٠) سواریان لەگەڵ ڕەوانە كرد بۆ دیمەشق، بەڵام پێڕی (قاضي القضاة) كۆمەڵێك لەتەتەرەكان ڕێیان پێگرتن و ڕووتیان كردن و هیچیان پێ نەهێشتن!!

٥- حُطَيْطُ الزيات:

(حطيط)یش یەكێكە لەو گەنجە خواناس و زانا شۆڕشگێڕانەی كە بەهەڵوێستی مەردانەیان ڕووی ئیسلامییان سپی كردۆتەوەو بەردێكی گەورەیان خستۆتە زاری ئەو بەناو زانایانەی كە بە بڕوبیانووی بێجێ ویستوویانەو دەیانەوێ پاكانەی هەڵوێستی ترسنۆكانەو نامەردانەیان بكەن، لەئاقار هەڕەشەو گوڕەشەی زۆردارو ملهوڕان ولاڕێ بووان دا.

ئەم زانا خوانا سەیان بردە لای (حجاج)ی خوێن ڕێژ، کاتێک گەیشتە لای لێی پرسی: تۆی (حطیط)؟! گوتی: بەڵێ.

ئینجا (حطیط) پێی گوت: هەرچی دەتەوێ بپرسە، پەیمانم لەگەڵ خوادا بەستوە لەنزیک (مقام)[1] لەسەر سێ شتان: ئەگەر پرسیارم لێ بکرێ ڕاستی بڵێم، وەئەگەر سزا بدرێم ئارام بگرم، وەئەگەر ولزم لێ بهێنرێ سوپاسی خوا بکەم.

(حجاج) پێی گوت: لەبارەی منەوە چ دەڵێی؟ گوتی: دەڵێم یەکێکی لەدوژمنانی خوا لەسەر زەوی، کاری ناڕەوا دەکەیو بەناهەق خوێن دەڕێژی.

(حجاج) گوتی: ئەدی سەبارەت بە (امیر المؤمنین عبدالملك بن مروان) چ دەڵێی؟!

گوتی: دەڵێم ئەو تاوانی زۆر لەتۆ زلترەو تۆ یەکێکی لە تاوانەکانی وی.

ئینجا (حجاج) فەرمانی دا سزای بدەن، پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر بەقامیشی تیژکراو هەموو لەشیان کون کون کردو گۆشت و ئیسکیان لێك جوێ کردەوە، بەلام گوێیان لەدەنگی ئاخ و ئۆفێکی نەبوو، ئینجا لەدەمی گیان دەرچوونیدا، (حجاج) گوتی: فڕێی بدەنە نێو بازاڕ –بۆ چاوترسێن کردنی خەڵکی وەك عادەتی هەمیشەیی زۆرداری فیرعەون سیفەتەکان–.

(جعفر) کە ڕاوی ئەم بەسەرهاتەیە، دەڵێت: کاتی خۆی (حطیط) برادەرم بوو، بۆیە چوومەلای و پێم گوت: هیچت ناوێ؟! گوتی: قمە ئاوێك! ئینجا دوای گەروو تەرکردن گیانی پاکی سپاردو لەتەمەنی (١٨)ساڵیدا شەهید بوو[2]!!

٦– ابی حازم:

(سلیمان بن عبد الملك) کە یەکێك بووە لەبەناو خەلیفەکانی ئیسلام، چۆ شاری مەدینەو بەدوای زاناترین کەسی مەدینەی دانارد کە (ابو حازم) بوو، بەلام (ابو حازم) نەچوو و گوتی: من هیچ کارم بەوی نیە، ئەگەر ئەویش کاری هەیە دەتوانێ بێت، ناچار (سلیمان) چوو بۆ لای، سلێمان لە (ابو حازم)ی پرسی: ئەرێ بۆچی هێندە لەمردن بێزارین؟!

---

[1] واتە (مقام)ی ئیبراهیم علیه السلام، کە لەتەنیشت کەعبەی پیرۆزە.

[2] بەلام حەیفێ کەبەناو زاناو بەرواڵەت پێشەوای واهەن کە لەتەمەنی (٨٠)ساڵیشدا ناوێرن چوار قسەی وا بکەن کە یەکێك هەر لێشیان تووڕە بێت، نەوەك شەهادەت بفەرموون، بێ ئاگا لەوەی کە شەهیدی بە هەموو کەس ڕەوا نابینرێ!.

گوتی: چونکە خانووی قیامەتێتان کاول کردووەو ئی دنیایەتان ئاوەدان کردۆتـەوە، بۆیـە پێتان ناخۆشە لە ئاوەدانیەوە بگوازنەوە بۆ وێرانە.

ئینجا پرسی: ئەیٚ (ابو حازم) چۆن دەچیتە خزمەت خوا؟! گوتی: مرۆڤی چاك وەك یەكێك كەلەسەفەریٚ گەڕابێتـەوە نێـو ماڵ و خێزانی، ئی خراپیش وەك كۆیلـەی هـەلاتوو لەچـەنگ گەورەكەی! سلیمان گریاو گوتی: خۆزگە دەمزانی لـەلای خوا چیم بۆ دانراوە!! گوتی: خۆت لەبەر كتێبی خوا ڕانوێنە، كەدەڵێت: ﴿إن الأبرار لفي نعيم وإن الفجار لفي جَحيم﴾، واتـە: چاكەكاران لەنێو نازو نیعمەت دان و بەدكارانیش لەدۆزەخیٚ دان.

سلێمان گوتی: ئەدی بەزەیی خوا لەكوێیە؟! (ابو حازم) گوتی: ﴿قريب من المحسنين﴾ لەچاكە كارانەوە نێزیكە.

سلێمان گوتی: ئەیٚ كام بەندەی خوا لەهەمووان بەڕێزترە؟! گوتی ئەوانەی پارێزكارو چاكن.

سلێمان گوتی: ئەدی چ كردەوەیەك چاكترە؟! گوتی: بەجیٚ هێنانی فەرمانەكانی خوا لەگەلٚ دوورە پەرێزی لەشتە قەدەغە كراوەكان.

سلێمان گوتی: چ قسەیەك چاكترە؟! گوتی: قسەی ڕاست لـەكن یەكێك جیٚی مەترسی یان جیٚی ئومێدو تەماع بیٚ.

سلێمان گوتی: چ مسوڵمانێك زۆری زیان كردوە؟

گوتی: كەسێك خۆی تووشی تاوان بكات لەپێناوی بابایەكی زۆرداردا، ئەو كەسە دوا ڕۆژی خۆی بەدنیای خەڵكی فرۆشتوە.

سلێمان گوتی: سەبارەت بەئێمە چ دەڵیٚی؟!

گوتی: وازم لیٚ دێنی نەیڵێم؟!

گوتی: نەخێر هەردەبیٚ بیڵیٚی، ئامۆژگارییە بۆ من.

(ابو حازم) گوتی: باب و باپیرانت بەزەبری شیر ملیان بەخەڵكی كەچ كردو ئەو پلەوپایەیان بە كوتەك ئەستاند، بیٚ ئەوەی ڕاوێژ بەمسوڵمانان بكەن و ڕازی بن، تاكو حەشامەتێكی زۆریان لیٚ كوشتن، ئێستاش مردوون، بەلاٚم بریا هەستت كردبا بەوەی كە لـەو دنیـا پێیـان گوتـراوەو گوتوویانە.

یەكێك لەدانیشتوان –كەیەكێك بووە لەبەناو زانا ترسنۆك و بەزیوەكان– گوتی: قسـەیەكی خراپت كرد.

(ابو حازم) گوتی: خوای گەورە گفت و پەیمانی لە زانایان وەرگرتوە ﴿لَيُبَيِّنُنَّه لِلنَّاس ولايَكتُمُونَه..﴾ ئاین و بەرنامەی خوا بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نەیشارنەوە[1].

٧- بديع الزمان سعيد النورسي:

سەعیدی نۆرسی کەزانایەکی شۆڕشگێڕو مسوڵمان بووەو خەڵکی کوردستانی تورکیایە، لەجەنگی جیهانی یەکەمدا ئەفسەر (ضابط) بوو لە سوپای دەوڵەتی عوسمانیداو، بەخۆو بە دەستەیەك لەقوتابییەکانی جەنگ و جیهادیان دەکرد دژی ڕووسیای داگیرکەر، لەگەڵ ژمارەیەك لەجەنگاوەرانی سوپای عوسمانی بەدیل گیرا.

لەکاتێکدا سەعید لەگەڵ هەندێك لەدیلەکان لە گرتووخانەیەك دا دانیشتبوو، سەرکردەی سوپای ڕووسیا لێیان وەژوور کەوت و هەموویان یەك پێ لەبەری هەستان و ڕێزیان لێ گرت بێجگە لەسەعید!

سەرکردەکە بەودیمەنە قەڵس بوو، بۆیە لەسەعیدی پرسی: بۆچی لەبەرم هەڵناستی؟ وادیارە نام ناسی؟! سەعید فەرمووی: با، چاکت دەناسم مەگەر تۆ سەرکردەی سوپای ڕووسیا نی؟

گوتی: با، کەواتە بەچاوی سوك سەیری دەوڵەتی ڕووسیا دەکەی؟ سەعید گوتی: مەسەلە ئەوە نیە، بەڵام من مسوڵمانم و بۆ غەیری خوا گەردن کەچ ناکەم! سەرکردەکە توڕە بوو و گوتی: سبەینێ پێویستە تۆ لەسێدارە بدرێی، بەیانی کەسەعید بۆ لەسێدارەدان بانگ کرا، سەرکردەکە لێی پرسی: تۆچی؟!

سەعید گوتی: من مسوڵمانم و بیروباوەڕم ئیسلامە.

سەرکردەکە کە هێندە بەمەردیی و جەسووری سەعیدی هاتە بەرچاو، لەبڕیاری لەسێدارەدانی ژیوان بۆوەو گوتی: ئایینێك کە توانیویەتی ئینسانی وەك تۆ پێبگەیەنێ شایەنی ڕێزگرتنە[2]!!

بەڵێ برادەرینە! مێژووی ئیسلامی لەپاڵ هەڵوێستی دزێو و ناقۆڵای بەناو زاناو بەرواڵەت پێشەوای بەزیوو ترسنۆك و دین فرۆشدا، هەڵوێستی ئەو کەڵە زانا چاو نەترس و دلێرانەشی

---

[1] ئەم شەش بەسەرهاتەم وەك چەند نموونەیەك لەکتێبی (الاسلام بین العلماء والحكام)ی عبدالعزیز بدري وەرگرتن، کە لەشاری بەغدا لەشەستەکاندا بەدەستی بەعسییەکان شەهید کرا.

[2] ئەم بەسەرهاتەی سەعیدی نۆرسیم لەکتێبی (من الفكر والقلب)ی محمد سعيد رمضان البوطي دا خوێندۆتەوە.

تۆمار کردوەو هیچ کەسێك بۆی نیە ڕەفتاری ترسنۆکانەی هەندێك بەناو زانا -کە بەهیچ جۆرێك ئیسلام بەرابەرو پێشەوایان قبوولْ ناکات- بکاتە بەلْگەی قسان و چاو لەهەموو ڕاستیەیان بقوچێنێ»[1] .

پوختەی قسان ئەوەیە، کە پابەندبوون بە ئیسلامەوە ماکی نەخۆشیو دەردەکانی ئێمە نیە، بەلْکو خراپ حالْی بوون و خراپ شوێن کەوتن بەم دەردەی بردوویـن و تووشـی ئەم ڕۆژەی کردووین.

## وەلاْمی ڕەخنەی چوارەم

سەبارەت بەخالْی چوارەمیش، یان ئێوە گوتەنی: پێلاقەی چوارەم!! دەلْێین:

١- کەس نکوولْی لەوە نیە کە بەناوی ئایینەوەو لەبەرگی ڕابەرو پێشەوای ئایینیدا ساختەییو خیانەت کراوەو دەکرێ، بەلاْم بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ ئەوە ببێتە هۆی ڕق هەلْگرتن لەئیسلامی پاك و بێگەرد، چونکە:

(أ) هەروەك زۆر جاری دیکە گوتومانە: ناتەواویو هەلْەی شوێنکەوتووی هیچ ڕێبازێك نالوێ بکرێتە بەلْگەی ناتەواوی ئەو ڕێبازە.

(ب) وەك لەخالْی سێیەمدا گوتمان: هەروەك چۆن بەناو زانای ناپاك و دین فرۆشمان هەبوو ون و هەن و دەبن، زاناو پێشەوای ڕاشمان هەبوون و هەشن، کەجێی شانازی نەك هەر ئێمە، بەلْکو جیهانن، کەواتە ئەگەر تۆ بابایەکی وەك مەلای خەتێ یان شێخی (......) بە وێنە دێنیەوە نابێ بێویژدانی وات لێ بکات: سەعیدی نوڕسیو صەلاحەدینی ئەییوبیشت لە یاد بچێ.

---

[1] بەلْێ بەهیچ جۆرێك ئیسلام کەسانێك بەرابەرو پێشەوا قبوولْ ناکات، کە یان لەترسان یان لەبرسان یاساو دەستوورەکانی خواو پێغەمبەرﷺ یان دەشێرنەوە یان خوارو خێچ دەکەن، چونکە میراتگری پێغەمبەر پێویستە لەخوا ترسان و ئازایەتیو ڕاستی تێدا بن، نەك لەخەلْك ترسان و ترسنۆکیو خواری، بەلْێ ئەوانەی خۆیان بەقوتابیو میراتگری پێغەمبەرﷺ دەزانن، پێویستە بزانن کە پێشەوایەکەیان خواناسیو ئازایەتیو ڕاستی لەدوای خۆی بەمیرات بەجێ هێشتوە نەك فیرعەون پەرستیو ترسنۆکیو بێباری!!

## شیکردنەوەی بەسەرهاتی مەلای خەتێ

٢- سەبارەت بەهەڵوێستی مەلای خەتێش لەسەر دەمی میر موحەممەدی ڕەواندزی‌دا، کەزۆر کەس کردوویانە بە بنێشتە خۆشکەی سەر زاریان و پێیان وایە پتەوترین بەڵگەی زیان بەخش بوونی ئیسلامە بۆ گەلی کورد، دەڵێن:

بەر لەهەموو شتێك باسەرنجی مێژوو بدەین! بزانین لەبارەیەوە چ دەڵێ‌و چۆن چۆنی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

(محمد امین زکی بگ) لەکتێبی (کوردو کوردستان)دا دەڵێت:

(ئەم میرە گەورەیە زۆر دیندار بوەو هیچ ئیشێکی بەبێ فتوای زانایانی شەرع نەکردوەو بەپێی قورئانی گەورەو سوننەتی پێغەمبەرﷺ ڕەفتاری کردوە، خەڵکی لەسەردەمی وی‌دا لە هێمنی‌دا ژیاون.

محمد پاشا دوای ئەوە سنووری حوکمڕانیەتەکەی خۆی فراوان کرد، تا لە ڕۆژهەلاتەوە گەیشتە کۆیەو ڕانیەو، لەخوارێوە گەیشتە ئامێدی‌و زاخۆو هەموو وڵاتی بادینانی گرتەوەو، لەرۆژئاواوە تا دەوروبەری موصڵ و سنجار چوو.

بەلآم دەوڵەتی عوسمانی چاوی بەرینایی نەداو (مصطفی رشید پاشا)ی ناردە سەری‌و والی بەغداو موصلیشی ئاگادار کردن بۆ کۆمەکی.

لەشکری (مصطفی رشید) بە جزیرەو زاخۆدا گەیشتە موصڵ و لەوێوە ڕووی کردە ڕەواندزێ‌و لەشکری بەغداشی پێ گەیی‌و لە دەشتی (حەریر) هەڵیان دا.

(محمد پاشا) گەلی عەلی بەگی گرتبوو، (مصطفی رشید پاشا) نامەی بۆ (محمد پاشا) نووسی‌و گفتی پی‌دا ئەگەر خۆی تەسلیم بکات لێی دەبووری‌و دەی نێرێتەوە شوێنی خۆی.

لەسەر ئەوە (میر محمد) نەی ویست خوێن لەنێواندا بڕژێ‌و لەسەر گفت و پەیمانی (مصطفی رشید) خۆی تەسلیم کرد، ئنجا ئەویش ناردیە ئەستەمبوڵ و لەوێ داوای لێ خۆش بوون و گەڕاندنەوەی بۆ کرد، بەلآم لەکاتی گەڕانەوەی (میر محمد)دا (مصطفی رشید) مردو (علي رضا پاشا) کە دوژمنی (مصطفی رشیدو) و (محمد پاشا) بوو، دەستبەجێ بۆ ئەستەمبووڵی نووسی کە ئەگەر (محمد پاشا) بگەڕێتەوە بۆ ڕەواندزێ هەڵسوڕانی کاروبار وەزەحمەت دەکەوێ.

لەسەر ئەوە ئەستەمبووڵ یەکسەر تەتەرێکی لەگەڵ فەرمانی کوشتنی (محمد پاشا)دا ناردو لەسیواس لەلایەن والی سیواسەوە لەسێدارەدرا، ئینجا (محمد پاشا) بەرەبەرە موڵکەکەی کەوتە دەست تورک وحوکمڕانیەکەی تێکچوو).

ئینجا محمد امین زکی لەپەراوێزی کتێبی ناوبراودا نووسیویەتی:

بەپێی ڕیوایەتێکی دیکە ڕۆژی جومعە دواندەر (خطیـب)ی ڕەواندزێ باسی بێ شەرعی جەنگەکەی کردوەو لەشکرەکەی سارد کردۆتەوەو محمد پاشاش بەناچاری تەسلیم بووە، ئەو مەلایەش بە "خطي افندي" بەناوبانگە).

ئەمە بە کورتی چۆنیەتی ڕوودانی ئەو کارەساتە بوو کە هەندێك کەسی بێ ئاگا، ئیسلامی پێ تاونبار دەکەن!

ئێستاش با بێین ئەو کارەساتە هەڵسەنگێنین و لە مەحەکی ژیریو ویژدانی بدەین، بزانین هیچ شتێك لەو کارەساتەدا دەبینرێ کە بگونجێ بکرێتە بەڵگەی زیانبەخش بوونی ئیسلام بۆکورد!!

هەڵبەتە ئەگەر ئەوەی (امین زکی) لەدەقی کتێبەکەیدا نووسیویەتی لەبەرچاو بگرین – پێویستە هەر ئەویش لەبەر چاو بگیرێ بەبەڵگەی ئەوەی کە (امین زکی بەگ) بۆ خۆشی خستوویەتە دەقی کتێبەکەیەوەو وەك ڕیوایەتەکەی‌تر نەیخستۆتە پەراوێز– جا ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرین ئەوە گومانی تێدا نیە کەلەو ڕووداوەدا هیچی تێدا نیە کە ئیسلامی پێ تاوانبار بکرێ.

بەڵام ئەگەر ئەو ڕیوایەتە بهێنرێتە نێو حیسابانەوە کە (امین زکی بگ) لەپەڕاوێزدا نووسیویەتی– بێگومان بۆیەش لە پەراوێزدا نووسیویەتی چونکە زۆر جێی بڕواو متمانەی نەبووە– ئەوە ئێمە لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئەم تێبینیانە لەو بارەوە دەخەینەڕوو:

یەکەم: ئیسلام بەیەك چاو سەیری هەموو تیرەو گەلەکان دەکات و ئیمتیاز نادات بەهیچیان، لەم بارەشەوە دەقی ئیسلامی زۆرن بۆ وێنە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (الناس بنو آدمَ وآدم خُلِقَ من تراب...) رواه الترمذي وابو داود، ورواه احمد والبيهقي نحوه، واتە: خەڵك وەچەی ئادەمن و ئادەمیش لەگڵ دروست کراوە...

هەروەها فەرموویەتی (...لَيسَ لأحَر علی اَحَر فضل إلابدينِ او تَقوی او عَمَلٍ صالح...) رواه احمد والبيهقي، واتە: ... هیچ کەس لەهیچ کەس چاکتر نیە، مەگەر بەدینداری، یان پارێزکاری، یان کردەوەی چاك...

دیسان (ابوذر الغفاري) خوا لێی ڕازبێ بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ پێی گوتوە (اُنظُر فانك لَستَ بِخَيرٍ مِن احمرَ ولا اسودَ إلا اَن تَفضُلَهُ بِتَقوی لله) رواه احمد، واتە: تەماشاکە! خۆتۆ نەلە سوور نە لە ڕەش چاکترنی، مەگەر بەهۆی پارێز لەخوا کردنەوە چاکتر بی!

مادام وابێ بۆ هیچ گەل و نەتەوەیەك نیە -بەهەر ناوێکەوە بێ- ستەم و زۆر لەنەتەوەیەکی تر بکات و نیشتیمانی داگیر بکات و مافەکانی لێ زەوت بکات، وەهیچ نەتەوەیەك بۆی نیە بەبێ ڕەزامەندی نەتەوەکان پێ لەسنووری نیشتیمانیان بەرێتە ئەودیو مادام هەموویان مسوڵمان یان مل کەچی حوکمی ئیسلامی بن.

کەواتە: هەڵوێستی سوڵتانی عوسمانی کە بریتی بووە لەتەماع تێکردنی خاك و ئاوی کوردان هەڵوێستێکە لەگەڵ ئیسلامدا ناسازێ.

دووەم: لەڕوانگەی ئیسلامەوە کاربەدەست ودەسەڵاتدار تەنها کاتێك فەرمانبەری و گوێڕایەڵی پێویست دەبێ لەلایەن گەلەوە کە:

یەك: بە شێوازو چۆنیەتی‌یەکی ئیسلامی‌یانە ئەو پلەو پایەیەی وەرگرتبێ -واتە لەسەر بنچیەی ڕاوێژو پرس کردن بە خەڵك[1].

دوو: کە بەگوێرەی شەریعەت و یاساکانی خوا ڕەفتار بکات، چونکە ﴿وَمَن لَم يَحكُم بِما انزَل الله فَاولئِك هُمُ الكافِرُون﴾ المائدة (٤٤)، واتە: هەرکەس بەپێی ئەو بەرنامەو دەستوورە ڕەفتار نەکات کە خوا ناردوویەتی، ئەوە ئەوانەن کافران.

ئاشکراشە کە سوڵتانی عوسمانی[2] -و ئەو کەسەش لەسەر ڕچەی سوڵتانی عوسمانی دەڕوا- هیچ کام لەم دوو مەرجەی تێدا نەهاتوونەدی.

---

[1] نەك وەکو کاربەدەست و دەسەڵاتدارەکانی ئێستا، کە بەزەبری ئاگرو ئاسن و قەمچی خۆیان بەسەر گەلدا دەسەپێنن.

[2] خەلیفە عوسمانی‌یەکان زۆربەیان چاك بوون و بەتەنگ ئیسلامەوە بوون لەگەڵ هەبوونی کەم و کوڕی و ناتەواویشدا، کەواتە لێرەدا مەبەست هەر لەو سوڵتانەیە کە ئەو جۆرە کارانەی لێ پشکووتوونەوە.

کەواتە: فەرمانبەریو گوێڕایەڵی بۆ بابایەکیوا لەڕوانگەی ئیسلامەوە نەك هەر پێویست نیە بەڵکو دروستیش نیەو حەرامیشە، ئەدی خوای زانا نەیفەرمووە ﴿واطيعوا الله واطيعوا الرسُول وَاولي الأمر مِنكُم..﴾ النساء (٥٩)، واتە: فەرمانبەری خوا بکەن، وەفەرمانبەری پێغەمبەرﷺ بکەن، وە ئەو کاربەدەستانەی کەلە خۆتانن.

وردبەوە! چۆن وشەی (منكم)ی کردوە بە (قید)ی (اولي الأمن)!!

کەواتە: گەورەو کاربەدەستێك فەرمانبەری کردنی پێویستە، کە لە مسوڵمانان بێت، واتە مل کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ بێت.

پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە فەرمویەتی (على المرءِ المسلم السمع والطاعة فيما أحب وكره، إلا أن يؤمر بمعصية، فإذا امر بمعصية فلا سمع ولا طاعة) متفق عليه عن ابن عمر، واتە: گوێ گرتن و فەرمانبەری لەسەر ئینسانی مسوڵمانە لەهەر شتێك دا پێی خۆش بیٚو پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە کردنی تاوانێك، ئەگەر فرمانی پێکرا بەکردنی تاوانێك، نە گوێ گرتنی لەسەرە نە فەرمانبەری.

کەواتە: بەگوێرەی پەیرەوی ئیسلام هەڵوێستی میری کۆرە -کە بریتیە لەڕاسان بۆ بەرەنگاری کردنی داگیرکەران- هەڵوێستێکی ئیسلامیانە بووەو هەوڵدان بووە بۆ بەجێهێنانی پێویستیەکی ئیسلامی.

**سێیەم:** یەکێك لەیاسا بەڵگە نەویستەکانی ئیسلام ئەوەیە: کە بێجگە لە پێغەمبەرﷺ هیچ کەسێکی دیکە بەپارێزەرو بێهەڵە (معصوم) دانانرێ[1].

کەواتە مەرج نیە هەرچی پێی گوترا زانای ئایینیو ناوو دروشمی پێشەوایەتی هەڵگرت، لەهەموو هەڵوێست وهەموو کات و شوێنێکدا هەر لەگەڵ ئیسلام و لەگەڵ ڕاستی دابێو، بەموو لەشەرع لانەدات، چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤەو قەت نابێتە فریشتەو وای لێ نایەت کە نەگونجێ هەڵەو تاوانی لێ بپشکوێتەوە.

ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە لە قورئانی بەڕێزو سوننەتی پێغەمبەرداﷺ لەچەند جێیەکدا ئاماژە بۆ ئەو بەناو زاناو زانایانە کراوە کەدنیادۆستیو ماددەپەرستی لە بەرنامەی

---

[1] ئیمامی مالیك لەو بارەوە فەرموویەتی (كل احد يؤخَذُ من قوله ويرد عليه إلا صاحب هذا القبرﷺ) بڕوانە (كشف الخفا ومزيل الألباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس) ب٢، ل١٥٥.

خوا هەتلەو لاڕێیان دەکات و تووشی چۆرتمێیان دەکات بۆ وێنە: خوای بالأدەست سەبارەت بەو جۆرە بەناو زانایانەی کە لەپێناوی ڕابواردنی کاتی دنیادا چاو لەڕاست دەقووچێنن و لەڕاستە شەقامی خوا لادەدەن فەرموویەتی ﴿واتل عليهم نبأ الذي آتيناه آياتنا فانسلخ منها فاتبعه الشيطان فكان من الغاوين، ولو شئنا لرفعناه بها ولكنه أخلد إلى الأرض واتبع هواه، فمثله كمثل الكلب إن تحمل عليه يلهث أو تتركه يلهث، ذلك مثل القوم الذين كذبوا بآياتنا، فاقصص القصص لعلهم يتفكرون﴾ الأعراف (١٧٥-١٧٦).

لێردا دەبینرێ کە زانای دنیاپەرست و لاڕێو هەتلەبوو، بەراوردی لەگەڵ سەگ دا پێکراوەو، وەك سەگێکی چاوچنۆکی ئێسك بەدەمەوەگر سەیر کراوە! چونکە هەروەك چۆن سەگ هەمیشەو دایم و دەرەم تەنگە نەفەسەو زمانی دەردێنێ، هەر بەهەمان شێوە زانای دنیاپەرست و هەتلەبووش هەمیشە چاوبرسیو چاوچنۆکەو بەهیچ شتێك سێبوریو تەسکینی نایەت، هەرچەند زۆریش خەریکی ماندووبوون وگەڕان و سووڕان بێ بەدوای دنیاو ئارەزووەکانیدا.

پێغەمبەریش ﷺ سەبارەت بەو جۆرە بەناو زانایانە، فەرموویەتی (يؤتى بالرجل يوم القيامة فيلقى في النار فتندلق اقتاب بطنه فيدور بها كما يدور الحمار في الرحا، فيجتمع إليه أهل النار فيقولون: يافلان، مالك؟! ألم تكُ تأمُرُ بالمعروف وتَنهى عن المنكر؟ فيقول: بلى كنت آمر بالمعروف ولا آتيه، وانهى عن المنكر وآتيه) متفق عليه، واتە: لەڕۆژی دوایی‌دا پیاوی وا دەهێنرێ فڕێ دەدرێتە نێو ئاگریو ڕیخۆڵەکانی لەورگی دێنە دەرێو وەك کەرێك کە ناعووریێ پێ ڕادەکێشن و بەدەوریدا هەڵدەسووڕێ ئاوا هەڵدەسوڕێ، ئینجا خەڵکی دۆزەخێ لێی کۆدەبنەوەو دەڵێن: هۆ فلان کەس! ئەرێ ئەوە چیتە؟! ئەدی تۆ فەرمانت بەچاکە نەدەکردو بەرهەڵستی خراپەت نەدەکرد؟ ئەویش دەڵێت: با -بەلأم- فەرمانم بە چاکە دەکردو بۆخۆم نەم دەکرد، وە بەرهەڵستی خراپەم دەکردو بۆ خۆم دەم کرد.

لە جێیەکی دیکەدا خوای بەرزو بێهاوتا هەر سەبارەت بەو جۆرە کەسانە دەفەرموێ ﴿مثل الذين حملوا التوراة ثم لم يحملوها كمثل الحمار يحمل اسفارا بئس مثل القوم الذين كذبوا بآيات الله والله لايهدي القوم الظالمين﴾ الجمعة (٥).

لێرەش دا دەبینین زانای بەدڕەفتارو ئیش نەکەر بەو کتێب و بەرنامەیەی خوا بۆی ناردووە، بەرانبەری پێکراوە لەگەڵ گوێدرێژێك دا کە بارێك کتێب و نووسراوی لێ هەڵبەستراوە!!

بەڵێ هەروەك چۆن كەر لەبەر كەرایەتی سوودمەند نابێ لەو بارە كتێبەی لەسەر پشتیەتی، بەناو زانای دین فرۆش و دنیاپەرستیش بەهەمان شێوە، هەرچەند بەرواڵەت هەڵگری زانیاریو هەڵگری بەرنامەی خوایە، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە كە خۆشەویستی ژیانی دنیاو ئارەزووە ماددییەكان دڵیان داپۆشیوە، هیچ لەو زانیاریو شارەزاییە بەهرەمەند نابێ كە هەڵیگرتوە.

بێگومان وادیارە كاتێك كە بابای شارەزاو زانا تاوان دەكات ولاڕێ دەبێ، خراپەو زیانێكی زۆر لەتاوان كردن و لەڕێ لادانەكەی وەدیدێ، بۆیە خوای قسە لەجێو زانا جارێك بەرانبەری پێدەكات لەگەڵ پیسترین گیاندارادا كە سەگە، وەجارێك بەراوردی پێدەكات لەگەڵ گیاندارێكدا كەناوی خۆی بەخۆوەیەو هیچ شتێك لەوی كەرتر نیە، خوای گەورە دەیەوێ پێمان بڵێت: بابای زاناو چاوساغ لەبەرنامەی خوادا، هەر كاتێك لایداو هەتلەبوو لەپیسیەتیدا دەچێتە ڕیزی سەگ و لەكەریەتیدا دەچێتە ڕیزی كەری!!

جا ئەگەر بێت و ئەو ڕیوایەتە ڕاست بێت كە (امین زكی بگ) لەپەراوێزدا نووسیویەتی – واتە: مەلای خەتێ فتوای دابێ كە جەنگ كردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بێ شەرعیو تاوانە– ئەوە ئەو كاتە ئەو مەلایە لەدوو حاڵ بەدەر نیە؛ یان لە فتوایەكەیدا بەهەڵەدا چووەو مەبەستی پیسی نەبووە، ئەوە لەم حاڵەتەدا بە بەهەڵەداچوو دادەنرێ، بەڵام تاوانبار نیە، هەرچەندە ئەم ئەگەرە زۆر دوورە چونكە دەڵێن مەلای خەتێ زۆر وریاو دادگەر بووە، یان لەبنەوە خۆیو ئایینەكەیو نیشتیمانەكەی فرۆشتوەو خۆی ڕوو زەردو شەرمەزاری لای خوا كردوەو هەگبەی تاوان و گوناهی پڕكردوە.

جا ئەگەر گریمان مەلای خەتێ هەڵەو تاوانێكی واشی كردبێ ئەوە ئەو پەڕی دەگوترێ: یەكێك لەڕابەرو پێشەواو زاناكانی ئیسلام لەڕێی خوا لایداو ناپاك دەرچوو، بەڵام جا تاوانی ئیسلام لێرەدا چییە[1] ؟!!

---

[1] ئەگەر بەوردیو بابەتییانە سەرنجی مێژووی میرنشینی سۆران و هۆی ڕووخان و تێكچوونی بدەین دوو جۆرە هۆكاری نێو خۆییو دەرەكی دەبینین كە هەركامێكیان ڕۆڵی خۆی هەبوە لەو بارەوە:

یەكەم: هۆكارە نێو خۆییەكان:

١– نابەرانبەری هێزی سۆران و هێزی پەلامارەدەر، چ لەڕووی چۆنایەتیو چ لەڕووی چەندایەنییەوە، چونكە سێ هێزی گەورە بەشدارییان كرد لەو هێرش وپەلامارەدا، یەكیان بەسەرۆكایەتی ڕەشید پاشا و، ئەویتر بەسەرۆكایەتی والی موصل و، سێیەمیشیان

بەسەرۆکایەتی عەلی ڕەزا والی بەغدا، وێڕای ئەمەش زیاتر لەدە هەزار (١٠٠٠٠) سەربازی نیزامی ئێرانی بەسەرۆکایەتی میر نیزام و پرچەك کردنی لەلایەن ڕووسیاوەو، سەرباری ئەمەش پشتیوانی نێودەوڵەتی بەتایبەتی بەریتانیا کەمیر محمد ئەوکاتە دژی سیاسەتیان بوو، یان ڕاستتر بڵێین سیاسەتی ئەوان دژی میر محمدو کیانە سیاسی یەکەی بوو!

٢- لاوازی گیانی خۆبەخت کردن و ئامادەیی بۆ بەرگری، لەسۆنگەی:

(ا) ڕەقیو توندی میر محمد لەگەڵ خزم و دۆست و دەورو بەرەکەیدا، کەبەزۆری بەزەبری کوتەك و خوێن ڕشتن سەری پێدانەواند بوون.

(ب) عەقڵیەتی خێڵەکیو عەشایەری، کە سەرەك خێڵ پتر لەخەمی خێڵ و عەشیرەتەکەی دایە هەتا شتیتر.

٣- نەبوونی بیروباوەڕو ستراتیژێکی ڕوون و دامەزراو لەلای سەرکردەکانی میرنشینی سۆران هەتا خەڵکی لەسەر کۆبکرێتەوەو گیانی بەرەنگاریو فیدا کارییان تێدا دروست بێت، بەڵێ ڕوون نەبوو ئایا هەستان و ڕاپەڕین و کیانە سیاسییەکەی میری کۆرە لەسەر بنەمایەکی ئیسلامی یان نەتەوەیی یان چینایەتییە!! دیارە هەبوونی پیاوانی زاناو خواپەرست و ڕێز لێ گیراو و پرس و ڕاوێژ پێکرانیان لەو میرنشینەداو، دینداربوونی شەخسی میری کۆرەش بەس نیە بۆ بەئیسلامی لەقەڵەم دانی کیانە سیاسییەکەی.

٤- کاریگەری مەعنەوی سوڵتانەکانی عوسمانی لەسەر خەڵکی بەگشتیو بەتایبەتی لەسەر زاناو (شێخ)ە کان، کەهەیبەت و حورمەتێکی تایبەتییان هەبوو.

دووەم: هۆکارە دەرکییەکان:

١- دەوڵەتە گەورەکان کاریگەری زۆریان بەسەر ساحەی کوردستانەوە هەبوەو هەرگیزیش هەبوونی کیانێکی کوردییان بەقازانجی خۆیان نەزانیوە، بەتایبەت دەوڵەی عوسمانیو ئێران و، لەپشت ئەمانیشەوە هەرکام لەڕووسیاو بەریتانیا کەچاوی تەماعیان بڕیبوە بەشی زۆربەی خاکی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیو ئێران.

٢- هاتنی عەلی ڕەزا بۆ وڵاتی بەغداو دانانی میر محمدو بیرقدار بەوالی ویلایەتی موصڵ و شارەزوور لەساڵی (١٨٣١)ی زایینیدا کەپێشتر بەدەسەڵاتی مەرکەزی بەڕێوە دەچوون وگوێیان نەدەدایە سەرهەڵدانی کیانێکیتر وەك میرنشینی سۆران، هەرچەندە ئەگەر سوپای ڕەشید پاشا نەهاتبایە هەردووك والی بەغداو موصڵ و شارەزوور نەیان دەتوانی زیانی گەورە لەمیرنشینی سۆران ⇦⇦

# سەلمێنرانی وەڵامەکان لەلایەن خاوەن پرسیارەوە

(هەتا ئەم قسانەم کردن نزیکەی سەعاتێکی خایەند، بەڵام -خوا هەڵناگرێ- وەڕەزیو بێ تاقەتیم لەدانیشتوانی کۆڕەکەدا بەدی نەکرد، چونکە وادیاربوو لەو جۆرە قسانە گوێ بیست نەبوو بوون.

ئەمجار ڕووم کردە کابرای ڕەخنەگرو گوتم:)

ها، کاکە! ئیستا ڕات چۆنە دەربارەی خراپەو زیانی زانایانی ئیسلام بۆ گەلی کورد؟!

---

بەدەن بەڵام یەککەوتنەوەی هەرسێکیان هیوای بەرەنگاریو بەرهەڵستی لەمیری کۆرەو سوپایەکەی بڕی.

بەڵێ! خوێنەری بەڕێز ئەمانە هۆکارە ئەسڵیو ڕیشەیی‌یەکانی ڕووخانی میرنشینی سۆرانن ئەگەر بویسترێ بەشێوەیەکی واقیعی‌یانەو بابەتیانە سەرنجی مێژوو بدرێو کەووشەن بکرێ، نەک بەشێوەیەکی عاتیفیو سەرکێڵ و بەمەبەست لەدڵگرتنی پێشتر -وەک خەتا بارکرنی ئیسلام- کەبەداخەوە زۆربەی ئەو مێژووزان و ئەدیب وسیاسی‌یە ناسیۆنالیستانەی لەو بارەوە قسەیان کردوەو شتیان نووسیوە کردوویانەتە پیشە، کە ویستویانەو دەیانەوێ بەبێ لەبەر چاوگرتن و حیساب بۆ کردنی ئەو هەموو هۆکارە بنەڕەتیو بەرچاوانە، ئۆباڵی ڕووخان و تێکچوونی میرنشینی سۆران بخەنە ئەستۆی مەلایەکی خواناسی کوردەوە، کەمن نازانم ئەو برادەرانە چۆن قەناعەت بەخۆیان دێنن کەبڕوابکەن بەقسەیەک و فتوایەکی مەلایەک حکوومەتێک بڕووخێو ئاداری بەسەر پاداری‌یەوە نەمێنێ(*)!!

تێبینی: بۆ نووسینی ئەم پەڕاوێزە -کەئی چاپی دووەمە- پشتم بە نامیلکەیەکی برای بەڕێز (کامەران جەمال) بەستوە لەگەڵ تۆزە دەستکاریو پوخت کردنەوەیەک دا، بەناوی: (میرنشینی سۆران) لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر مێژووی سیاسی میرنشینی سۆران، سەرەتای سەدەی پازدەهەم - ١٨٣٦، چاپی یەکەم، ١٩٩٧، هەلێر.

---

(*) زۆرن ئەو برادەرانەی بەناوی لێکۆڵینەوەی مێژووییو بەرگری لەکورد! ئەوقسەو تۆمەتەیان لەکتێبەکانیان دا نووسیوە، بۆ وێنە: حسێن حوزنی موکریانی، د. عبدالرحمن قاسملۆ، د. جەلیلی جەلیل.

گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ پێش ئەم دانیشتنە، قەت بڕوام نەدەکرد ڕۆژێك لەڕۆژان دڵم لەداخ وخەفەت و ڕق هەڵگرتن لەئیسلام پاك بێتەوە، ئەمما بڕوا بکە بیروباوەڕم لەو بارەوە گۆڕانێکی بنچی بەسەر داهات و ئیستا دەزانم کە بەرنامەی خوا پاك و بێ خەوشەو ماقووڵ نیە هیچ تاوان و سووچێکی بدەینە پاڵ.

یەکێکی دیکە لەدانیشتوان گوتی: ئەرێ کاکە وەك گوتراوە: (الاحسان بالتمام)، بۆچی لەو بارەوە زیاتر نادوێی، چونکە من یەکەبارێ خۆم لەزۆر مەسەلاندا ئێستاش نەگەیشتوومەتە دڵنیایی‌ی تەواوو بەدەردی کورد دەڵێن: (دڵم ئاوی نەخواردۆتەوە).

گوتم: جا فەرموون ئێوە پرسیار بکەن، لەسەر منیش پێویستە ئەوەندەی دەزانم بەڕاست و دروستی بێ پێچ و پەنا وەڵامتان بدەمەو چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (من كتم علماً الجَمَهُ الله بِلجام من نارٍ يَومَ القِيامة) رواه أبوداود والترمذي والحاكم، واتە: هەر کەسێك زانیاری‌یەك بشارێتەوە خوا لەڕۆژی دواییدا لغاوێکی ئاگرینی دەزاری دەکات!!

گوتی: ئایا ئیسلامەتی ڕای چی‌یە سەبارەت بەبیری نەتەوایەتی‌و خۆشویستنی گەل و نیشتیمان؟!

## تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتی

## ﴿یا ءیها الناس إنا خلقناکم...﴾

گوتم: خوای زاناو کاربەجێ پشتیوان بێ، دەتوانین لەبەر تیشکی تاقە ئایەتێکی قورئانی قسەلەجێ‌و بەڕێزدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، خواوەند لە سوورەتی (الحجرات)دا فەرموویەتی ﴿یا ءیها الناس إنا خَلَقناكُم مِن ذَكَرٍ وَانثى. وَجَعَلناكُم شُعُوباً وَقَبائِل لِتَعارَفوا. إن اكرَمَكُم عِندَ الله اتقاكُم. إن الله عليم خبير﴾ (١٣)، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لەنێر (ئادەم) و مێ (حەووا)یەك خوڵقاندوە، وە کردوومانن بەچەند گەل و تیرەیەك بۆ ئەوەی یەکدی بناسن، بەڕێزتریشتان لەلای خوا پارێزکارترتانە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەگونجێ‌و هەڵدەگرێ بکرێتە سەرچاوەی وەڵامی تێکڕای ئەو پرسیارانەی سەر بەمەسەلەی نەتەوایەتین.

ئێستاش باناوی خوای لێ بێنین و دەست بەهەڵهێنجانی ئاوی سازگارو شیرینی سەرچاوەی ئەم ئایەتە بەپێزە، بەشکم لەمەر دۆلکەیەك لە ئاوی بێ گەردو سازگاریی گەرووی یەكێك لەو پرسیارانە تەڕبیو بگرە تینوایەتیشی بشكێ، بەلام مەرج ئەوەیە چاك گوێ بگرین و بەدڵ تێفكرین.

... دەتوانین لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەم یاسایانەی خوارێ دەستگیر بكەین:

١- یەكەمین یاسا كەلەم ئایەتە دەفامرێتەوە، ئەوەیە كە لەبەرنامەی ئیسلامدا بەیەك چاو سەیری مرۆڤایەتی دەكرێو هیچی بەسەر هیچیدا هەڵناكێشرێو كەس بەرزتر دانانرێ.

بەڵێ! لەئایینی خوادا مرۆڤایەتی بەگشتی وەكو یەك حیسابیان بۆ دەكرێ، بۆیە لەقورئانی بەپێزدا لەچەندەها شوێندا وشەی: (الناس) خەڵك، (الانسان) مرۆڤ، (بني آدم) ئادەمیزادەكان، دووبارە كراونەوە، بێگومان هەركامێكیشیان دەلالەت لەسەر تێكڕای ئینسانەكان دەكات بەیەكسانیو بێ جیاوازی.

بەڵێ ئیسلام هەموو مرۆڤەكان وەك یەك تەماشا دەكاو نالێت: فلانە میللەت[1] یان فلانە رەگەز[2]، یان فلانە نەتەوە[3]، یان فلانە چین[4]، یان فلانە رەنگ[5]، یان فلانە وەجاخ[6] ئیمتیازو زیادەی هەیە بەسەر باقی مرۆڤایەتیدا.

ئەم یاسایەی گوتمان لە نیمچە رستەی ﴿یاءیها الناس﴾ وەردەگیرێ.

٢- دووەمین یاسا كەلەم ئایەتە وەردەگیرێ، ئەوەیە كەخوای پەروەردگار بەدیهێنەرو سەرپەرشتی كەری هەموانە بەبێ جیاوازیو، هیچ كام لە لەمرۆڤەكان یان نەتەوەو تیرەكان

---

(١) وەك جووەكان دەڵێن: (نحن شعب الله المختار) ئێمە میللەتی هەڵبژاردەی خواین!

(٢) وەك نازییەكان وفاشییەكان دەناگوت.

(٣) وەك رەگەزپەرست و نەتەوەپەرستەكان گوتویانەو دەیلێن.

(٤) وەك شیوعیو ماركسییەكان دەڵێن.

(٥) وەك شارستانیەتی رۆژئاوای سەدەی بیست دەڵێت.

(٦) وەك هەندێك لەئاغاو بەگ و شێخەكان دەڵێن، (بێگومان هیچ كام لەمانە لەبەر خودی ناوەكەی بەخراپ دانانرێ، مادام خۆی بەرەچەڵەكەیەوە هەڵنەكێشیو خۆی بەزیاتر نەگرێ).

لەوانی دیکە زیاتر بەشی بەخواوە نیەو لێی نزیکتر نیە، ئەم یاسایەش لەڕستەی ﴿إنا خلقناكم﴾ وەردەگیرێ.

٣- سێیەمین یاسا کە ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ دەکات، ئەوەیە کە بەندەکان تێکرا لەیەك ڕەچەڵەك و بنەڕەتەوە هاتوون و وەك یەك خوڵقێنراون و خوا هەندێکیانی لەوانی دیکە باشتر نەخوڵقاندوە، وەك جوولەکەو ڕەگەزپەرست و نەتەوەپەرست و چین پەرست و ڕەچەڵەك پەرستەکان دەڵێن.

پێغەمبەری پێشەواش ﷺ لەم بارەوە دەفەرموێ (لَيَنتهِين أقوام يفخرون بآبائهم الذين ماتوا، إنما هم فحم جهنم، أو ليكونن أهون على الله من الجُعَل الذي يُدَهدِهُ الخَرءَ بأنفه، ان الله تعالى أذهب عنكم عُبيَّةَ الجاهلية وفخريتها بالآباء، إنما هو مؤمن تقي وفاجر شقي، الناس بنوا آدم، وأدم خلق من تراب) رواه أبوداود والترمذي وحسنه، واتە: کەسانێك کە خۆیان بە باب و باپیرانێکیانەوە هەڵدەکێشن کە مردوون و، بێگومان بوونەتە خەڵووزی دۆزەخ، دەبێ واز لەو ڕەفتارەیان بێنن، ئەگەرنا لەلای خوا لەو قالۆنچەیە نابووت تر دەبن کە بەلووتی پیسایی خڕ دەکات و خلۆری دەکاتەوە، بێگومان خوای بەرز خۆبەزلگری سەردەمی نەفامیو شانازی کردن بەباب و باپیرانی لەنێوەدا لابردوە، ئینسان -لەتەرازووی خوادا دوو جۆرە- بڕوادارێکی پارێزکارو خراپە کارێکی بەدبەخت، خەڵکی وەچەی ئادەمن و ئادەمیش لەگڵ درووست بووە!

دیسان پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە فەرموویەتی (اسمعوا وأطيعوا وإن أمر عليكم عبد حبشي كأن رأسهُ زبيبة) رواه البخاري، واتە: گوێڕایەڵیو فەرمانبەری بکەن، تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی -ڕەشی- حەبەشیشتان لەسەر کرایە سەرۆك و فەرمانڕەوا، کە سەری وەك و مێوژێ وابوو.

بەڵێ سەرچاوەی هاتنەدیو دروست بوونی هەموو مرۆڤایەتی دایك و بابێکن، هەموویان لەئادەمن و ئەویش لە گڵە، کەواتە هیچ مرۆڤێك ناتوانێ لاف ئیمتیازو زێدەیی لێ بدات بەسەر غەیری خۆیدا، ئەم یاسایەش لەنیمچە ڕستەی ﴿من ذكر وأنثى﴾ فامرایەوە.

٤- چوارەمین یاسای نێو ئەم ئایەتە بەپێزە ئەوەیە کە مرۆڤایەتی بەپێی ویستی خوای بالادەست کراوە بەچەند تیرەو نەتەوەیەك. ئەم یاسایەش لەڕستەی ﴿وجعلناكم شعوبا وقبائل﴾ وەردەگیرێ.

ئەم بەشەی ئەم ئایەتەش لەهەموو بەشەکانی دیکە زیاتر وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی هەڵدەستن، کەواتە: حەوجێی بە توێژینەوەو تێوەڕامانێکی زیاتر دەکات.

پێش هەموو شتێك پێویستە چەمك و مانای بێژە (لفظ)ەکانی بزانین.

١- بێژەی (جعل) بەپێنج مانایان دێت:

(أ) بەمانای (صار) و (طَفِقَ)، وەك: (جعل محمد ينشد الشعر).

(ب) بەمانای (أوجد) و (خلق)، وەك: (وجعل الظلمات والنور).

(ج) بەمانای پەیدا کردنی شتێك لەشتێکی دی، وەك (وجعل لكم فيها سبلا).

(د) بەمانای گۆڕینی شتێك لەبارێکەوە بۆ بارێکی دیکە، وەك ﴿وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا﴾.

(هـ) بەمانای حوکم کردنی شتێك لەسەر شتێك، وەك ﴿ويجعلون لله البنات﴾.

دیارە ئەوەی کە (جعل) لێرەدا دەلالەتی لەسەر دەکات مانای چوارەمیانە، چونکە خوای بەرز دوای ئەوەی مرۆڤی لەدایك و بابێك خوڵقاند، کردی بەچەند تیرەو نەتەوەیەك، واتە لەحالێکەوە گۆڕی بۆ حاڵێکی دیکە.

٢- بێژەی (شعب)یش یانی: تیرەیەکی بڵاوبووەوەو پەل هاوێشتوو (القبيلة المتشعبة)[1].

٣- بێژەی (قبيلة)ش واتە: کۆمەڵە خەڵکێکی کۆبووەوە کە هاوشۆی یەگدی دەکەن (جماعة مجتمعة يقبل بعضها على بعض)، هەڵبەتە (قبائل)یش کۆی (قبيلة)یە[2].

ئێستا چەمك ومەبەستی یەك یەکی وشەکانی ئەم ڕستەیەمان توێژیەوە، باناوی خوای لێ بهێنین و سەرنجێك لەدەریا قووڵە پڕ لەگەوهەرو مرواریەکەی بدەین:

لەبەر تیشکی توێژینەوەی یەك یەکی وشەکانی ئەم ڕستە قورئانییەدا دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین هەرکام لە کوردو عارەب و تورك و هیندو فارس و... هتد نەتەوەو گەلن، چونکە

---

[1] محمد فريد وجدی لە (دائرة المعارف القرن العشرين)دا دەڵێت: (الشعب مجموع قبائل الأمة الواحدة) واتە: گەل کۆی تیرەو هۆزەکانی نەتەوەیەکە، سەیری بەرگی (٥)، ل٢٨٩ بکە.

[2] مانای هەموو ئەو وشانە لەکتێبی (معجم مفردات الفاظ القرآن) نووسراوی (راغب الأصفهاني) وەرگیراوە.

هەرکامێکیان لەچەند تیرەو هۆزێك پێك دێن بەڵگە نەویستیشە کە هەموو گەل و نەتەوەیەك پێویستە خاوەنی نیشتیمانێکی سەربەخۆو زمانێکی سەربەخۆ بێت.

بەڵێ هەرکام لەنیشتیمان و زمان شتێکی حەتمیو پێویستن بۆ بەگەل حسێب کرانی گەل، خاك و ئاو تاکو بژێوی تێدا پەیدا بکەن و تێیدا بحەوێنەوە، زمانیش تاکو پێی لەیەکدی حاڵی بن، جا ئەلێرەدا لووت و بزووت لە ئەنجامێکی زۆر بایەخ دار هەڵدەنگووین:

... ئێمە لەدەمی توێژینەوەو شیکردنەوەی بێژەری (جعل)دا گوتمان: پێنج مانایان هەڵدەگریو یەکیان لێرەدا دەگونجێ، ئەویش بریتی‌یە لە گۆڕان بەسەر شتێك داهێنان لەحاڵێکەوە بۆحاڵێکی دیکە.

واتە: خوای بەخشندە لەحاڵەتی نێرو مێیەکەوە ئینسانی گۆڕی بۆ حاڵەتی دابەشبوون بەسەر چەندان گەل و تیرەدا.

دیارە ڕاناوی (نا) لە وشەی (جعلنا)دا بۆ خوای بێهاوەڵ دەگەڕێتەوە، کەواتە: ئەو کەسەی مرۆڤەکانی کردوون بەچەند گەل و تیرەیەکی جیاجیا پەروەردگاری بێ هاوتایە، دەئێستا دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین: پەروەدگار هەر لەدەمی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستی‌یە کە مرۆڤاکانی دابەش کردوون بۆ چەند نەتەوەو تیرەیەك، ئەوەشی ڕاگەیاندوە کە پێویستە هەرکام لەو نەتەوانە خاوەنی نیشتیمان و زمان و ئەدەب و کەلەپوورو خەسڵەتە نەتەوایەتی‌یەکانی دیکەی خۆی بێت، واتە: بۆ وێنە گەلی کورد پێویستە لەنیشتیمانی خۆی‌دا -کە کوردستانە- نیشتەجێ بێو بەزمانی خۆی بدوێو پاریزکاری لەهەموو ئەو خەسڵەتە نەتەوەیی‌یانەی دیکەی بکات کە بەشدارن لە پێکهێنانی نەتەوەیەك داو بیچم و کەسایەتی‌یەکی سەربەخۆی پێدەبەخشن.

جا مادام هاتنەدی تیرەو نەتەوەکان بەویستی خوا بووبێو تیرەو نەتەوەکانیش بەبێ هەبوونی خەسڵەتە پێکهێنەرەکان، لەخاك و ئاوو ڕەنگ و زمان و نەریت و خوو و ئەدەب و کەلەپوورو... هتد مەحاڵە، کەواتە:

هەرکەسێك بیەوێ یەکێك لەخەسڵەتە تایبەتی‌یەکانی نەتەوەیەك بفەوتێنێ، مانای وایە ویستوویەتی ببێتە جێی مەترسی بۆ تێداچوونی نەتەوەیەك، چونکە هەبوونی نەتەوە بەبێ پێکهێنەرە بنەڕەتیەکانی لەخەیاڵ پلاوێ بەدەر نیە.

هەر كەسێكیش بیەوێ نەتەوەیەك بفەوتێنێ ئەوە دژ بەویستی خوای كاربەجێ هەنگاوی ناوە، هەر كەسێكیش ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی لەگەڵ خوادا بكات ڕیسوای دەكاو پشتی دەشكێنێ و وەك ئەو بزنە گێل و نەفامەی لێ بەسەر دێ كە لەگەڵ گاشە بەردێكی زلدا شەڕە قۆچی دەكات!!

لێرەدا ئەو برادەرە كە پرسیارەكەی كردبوو گووتی: كاكە گیان بەڕاستی ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگ و بایەخ دارە، تكایە زیاتر بۆمان ڕوون بكەوە.

گوتم: بەڵێ بەچاوان، جا مادام وایە با لەچەند خاڵێكدا ئەو مەبەستانە رابگەیەنین كەپێشتر بەكورتی باسكران:

## یەكەم: ڕای ئیسلام سەبارەت بەخۆشویستنی گەل و نیشتیمان

گومان لەوەدا نیە كە ئیسلام بەگوێرەی سرووشتی ئینسان نێرراوە، واتە: بۆیە نێرراوە كە گشت داخوازیەكانی سرووشتی ساغی مرۆڤ جێبەجێ بكاو هەموو غەریزەكانی تێر بكات و، وەڵامی هەموو پرسیارەكانی بداتەوە[1].

جا ئێستا بپرامێنین، ئایا خۆشویستنی گەل و نیشتیمان غەریزەو داخوازییەكی ڕەسەنی سرووشتی ئینسانە، یانا؟! هەڵبەتە ئەگەر غەریزەو داخوازییەكی ڕەسەنی سروشتی بێت، پێویستە ئیسلام نەك هەر دژایەتی نەكات بەڵكو پێشوازیشی لێ بكات و بەگەرمیش بەخێرهاتنی بكات، بەڵام ئەگەر غەریزەیەكی ڕەسەن و داخوازییەكی سرووشتی نەبێت، دیارە ئیسلام دانووی لەگەڵیدا ناكوڵێ و پێكەوە هەڵناكەن.

---

[1] خوای بەخشندە لەو بارەیەوە فەرموویەتی ﴿فاقم وجهك للدين حنيفاً فِطرَةَ الله التي فَطَرَ الناس عليها لاتبديل لخلق الله ذلك الدين القيم ولكن اكثر الناس لايعلمون﴾ الروم (٣٠)، واتە: ڕووی خۆت ڕابگرە بەرانبەر بەئایینی ڕاست و تەواو -وپێیەوە پابەند بە-و خۆتی بۆ یەكلا بكەوە، ئەو ئایین و بەرنامە خواییەی كە بەپێی ئەو سرووشتە ناردوویەتی كە خەڵكی لەسەر خوڵقاندوە، ئەو سرووشتەش گۆڕانی بەسەردا نایەت چونكە دەستكردی خوایە، ئەو یاسا و بەرنامەیەش تاقە ئایین وبەرنامەیەكی ڕاست و تەواوە بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

بۆ سەلماندنی ڕەسەنایەتی غەریزەی خۆشەویستی گەل و نیشتیمانیش لەسرووشتی ئینساندا پشکنین و گەڕانێکی زۆرمان گەرەك نیەو هەر یەکێکمان -ئەگەر لەخۆی نەگۆڕێ- هەستی پێ دەکات.

بەتایبەتیش ئەو هەست پێکردنە لەکاتێکدا زیاتر دەبێتە شتێکی دیارو بەرچاو کە ئینسان لەگەڵ و نیشتیمانەکەی دوور دەکەوێتەوەو بۆیان تامەزرۆ دەبێت.

کێ هەیە هەستی بە هەڵکڕوزان و بۆسۆی دڵ وەدەروونی نەکردبێ لەکاتێکدا ئاوارە بووەو لەخاك و ئاوو مەنزڵگای خۆیو خزم و کەس و خۆشەویستانی وەدوور کەوتوە؟!

یان کێ هەیە کە لەژیانی ئاوارەیی‌و دوورە وڵاتی لەدەمی دیتنی هاوزمان و هاونیشتیمانی‌یەکی‌دا دڵی نەپشکوێو لەخۆشیان گەشکە نەگرێ؟!

هەڵبەتە لێرەدا قسەم لەگەڵ بابایەکی بێ هەست وئەست و دڵ مردوو نیەو، بەڕێزیەڕان (شواذ)یش یاسا هەڵناوەشێتەوە.

بەڵێ! نیشتیمان لەبەر چاوی مرۆڤ دڵگیرو خۆشەویستە، هەر بۆیەش پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (إن أُحُداً جَبَلٌ يُحِبنا ونُحِبه) رواه الشيخان عن انس[1] ، واتە: ئوحود شاخێکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێ.

دیسان فەرموویەتی (اللهم حَبب إلَينا المَدينَةَ كَحُبنا مَكةَ او اشَدَ...) رواه الشيخان عن عائشة رضـي الله عنها[2] ، واتە: ئەی خوایە! شاری مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە وەك خۆشەویستیمان بۆ شاری مەککە یان زیاتریش.

... هەروەها لەفەرمایشتێکی دیکەدا سەبارەت بەشاری مەککە فەرموویەتی (ما اطيبَكِ مِن بَلَدٍ واحَبكِ إلَي، ولولا ان قَومي اخرَجُوني فيكِ ماسَكَنْتُ غَيرَكِ) رواه الترمذي عن ابن عباس[3] ، واتە: چەند نیشتیمانێکی خۆشی وە چەندم لەلا خۆشەویستی!! وەئەگەر گەلەکەم لەتۆ وەدەریان نەنابام بێجگە لەتۆ لەهیچ جێ‌یەکی‌تر دانەدەنیشتم!!

[1] بڕوانە (تاج الأصول)، ب٢، ل١٨٧.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٦.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٣.

دیارە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش ﷺ کەچاکترین و ڕاسترین نموونەی جێبەجێ کردن (تطبیق)ی ڕاست و دروستی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بوو ون، سەبارەت بەو هەست و نەستە سادەو سرووشتی یەی کە ناومان لێنا (سۆزی نەتەوایەتی) هەر هەمان هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ یان هەبووە، بۆ وێنە:

دەگێڕنەوە[1] کە (بیلالی حەبەشی) خوا لێی ڕازی بێ پاش کۆچکردنی بۆ شاری مەدینە نەخۆش دەکەوێ، هەست و نەست و سۆزی کوڵی گەرم و بەتینی نێو دەروونی سەبارەت بەشاری مەککە لەم چەند دێڕە شیعرەدا دەردەبڕێ:

الا ليت شعري هل ابيتن ليلة
بفخ وحولي إذخر وجليل

وهل أردن يوما مياه مجنة
وهل يبدون لي شامةٌ وطَفيل

واتە: ئەرێ خۆزگە زانیبام داخوا ڕێ دەکەوێ هیچ شەوان لە (فخ) -کەناوی شوێنێکە- بمێنمەوە، لەحاڵێکدا کە (اذخر)و (جليل)م لە دوورەوە بن.

وە ئایا هیچ ڕۆژان دەچمەوە سەر ئاوی (مجنة)؟ وەئایا جارێکی دی (شامة)و (طفيل)م لێ وەدەردەکەون[2] ؟!

ئێستاش کە بۆمان ڕوون بۆوە خۆشەویستی گەل و نیشتیمان خەسڵەتێکی سرووشتی یە لە مرۆڤداو غەریزەیەکەو بەشێکە لە پێکهێنەرەکانی ئینسان، دەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین:

ئیسلامەتی نەك هەر دژایەتی و ناکۆکی لەگەڵی نیە، بەڵکو فەرمانیشی پێ دەکات، هەروەك چۆن دژایەتی لەگەڵ غەریزەی جینسی دا نیەو، زیاد لەوەش تێرکردن و بەدەنگەوەچوونی بەچاکەو خواپەرستی دادەنێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (... وفي بُضع احدكم صَدَقَة، قالوا! يارسول! اياتي احدنا شهوتَه ويَكون لَهُ فيها اجر؟! قال ارايتُم لو وَضَعَها في حَرام اكان عليه وزر،

---

[1] بڕوانە: مجموع رسائل الإمام الشهيد حسن البنا، ل١٧-١٨)، هەروەها: (اسلام وناسيوناليزم)ی ابو الاعلى المودودي ، ل٤٧.

[2] (فخ ومجنة وشامة وطفيل) ناوی چەند شوێنێکن لەناوچەی مەککە، (اذخر وجليل)یش دوو جۆرە گیان.

فَكَذٰلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجرٌ) رواه مسلم، واتە: لە سەرجێیی[1] کردنی یەکێکتاندا پاداشت هەیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا یەکێك لەئێمە ئارەزووی جێبەجێ دەکاو پاداشتیشی هەیە؟! گوتی: ئایا ئەگەر ئەو ئارەزووەی خۆی لە جێیەکی حەرامدا جێبەجێ کردبا تاوانی لەسەر نەدەبوو! هەر ئاواش ئەگەر ئارەزووەکەی لەگەڵ حەڵاڵی خۆی جێبەجێ بکات پاداشتی چاکی هەیە.

بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە پێویستە نیگایەکی پێدا بخشێنین، ڕەنگە هەندێك کەسی کەللە وشك و زیادەڕەو بڵێن: چۆن بۆت هەیە (خۆشەویستی گەل و نیشتیمان) بە غەریزەیەکی ڕەسەن و شتێکی سرووشتیو ڕەوا دابنێی! مەگەر بێ ئاگای لەو فەرمایشتەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ (ليس منا من دعا إلى عَصَبِيةٍ،وَلَيسَ مِنا مَن قاتَل على عصبية، وَلَيسَ منا من مات على عَصَبية) رواه أبو داود عن جبير بن مطعم[2] ، واتە: هەر کەسێك بانگەوازی بۆ دەمارگیری بکات لەئێمە نیە، وە هەر کەسێك لەسەر دەمارگیری بجەنگێ لەئێمە نیە، وەهەر کەسێك لەسەر دەمارگیری بمرێ لەئێمە نیە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: با، زۆر چاك لەم فەرمایشتە ئاگادارین، بەڵام ئەم فەرمایشتە ناکۆکیو دژایەتی نیە لەگەڵ ئەو مەبەستەدا کە ئێمە لێی دەدوێین، چونکە خۆشەویستی گەل و نیشتیمان لەگەڵ دەمارگیریدا لێك جوێن، پێغەمبەریشﷺ ئەم فەرمایشتەی دژ بە دەمارگیری (تعصب) فەرمووە، نەك دژ بە خۆشەویستی گەل و نیشتیمان، ئێستاش بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست دوو خاڵ دەخەینە ڕوو –واتە بۆ سەلماندنی هەبوونی جیازای لەنێوان دەمارگیریو خۆشەویستی گەل و نیشتیمان دا–:

١– کچی وائیلەی کوڕی ئەسقەع دەڵێ: سمعت ابي يقول: قُلتُ: يارسول الله! ما العصبية؟! قال: (أن تعين قَومَك على الظلم) رواه أبو داود[3] ، واتە: لەبابم بیست دەیگوت: بە پێغەمبەرم گوت: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دەمارگیری (عصبية) چییە؟! فەرمووی: ئەوەیە کە لەسەر ناهەق پشتگیری گەلەکەت بکەی.

---

[1] سەرجێیی کردن کینایەیە بۆ جووت بوونی پیاو لەگەڵ هاوسەریدا.

[2] بڕوانە: فيض القدير، ب٥، ل٣٨٦، بە ژمارە (٨٦٨٣)، هەروەها: سنن ابي داود، ب٢، ل٦٢٥.

[3] بڕوانە: سنن ابي داود، ب٢، ل٦٢٥.

بەڵێ! خۆشویستنی گەل و نیشتیمان ئەگەر بەشێوەیەکی هەڵەو ناتەواو بێ، دەبێتە نەتەوەپەرستی (ناسیۆنالیزم)و دەمارگیری، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی میانەڕەوانەو ڕاست بێ، ئەوە نەك هەر خراپ نیە بەڵکو بەیەکێك لەخەسڵەتە باشەکانی ئینسانی مسوڵمان دەژمێررێ، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (خَيرُكُمُ المُدافِعُ عَنْ عَشِيرَتِهِ مالَمْ يَأثَمْ) رواه ابو داود[1].

دیسان دەربارەی دەمارگیریو نەتەوەپەرستی، ڕابەرمانﷺ فەرموویەتی (مَنْ نَصَرَ قَومَهُ عَلى غَيرِ الحَقِ، فَهُوَ كَالبَعيرِ الذي رَدِيَ فَهُوَ يَنزَعُ بِذَنَبِهِ) رواه ابو داود[2]، واتە: هەر کەسێك لەسەر ناهەق پشتگیری گەلەکەی بکات، ئەوە وەك ئەو حوشترە وایە کە کەوتۆتە چاڵێکەوەو بەکلکی دەری دێننەوە!

جا ئێستا کە زانیمان چۆن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە جیاوازی نێوان خۆشەویستی گەل و نیشتیمان و گەل و تیرە پەرستیو دەمارگیری کراوە[3]، باتۆزێك لەدەلاقەی عەقڵیشەوە لەم مەسەلەیە ورد بینەوەو خاڵی دووەمیش بخەینە ڕوو:

---

[1] بڕوانە: سنن ابي داود، ب٢، ل٦٢٥، هەندێك لەزانایان ئەم فەرموودەیە لەڕووی (سند)ەوە بەلاواز دەزانن، بەڵام نێوەرۆکەکەی ڕاست و بەجێیەو بێ گرێیە.

[2] بڕوانە: سنن ابي داود، ب٢ ، ل٦٢٤.

[3] پوختەی قسان ئەوەیە کە (عصبية) کە زانایان بە (پشتگیری کردنی تیرەو گەل لەسەر ناهەق) لێکیان داوەتەوەو ئێمەش لەزمانی کوردیدا (دەمارگیری)مان لەبەرانبەردا ڕۆناوە، بەپێشەی سەرەدەمی نەفامیو بە هەڵوێست و ڕەفتارێکی بێ شەرعی لەقەڵەم دەدری(*)، چونکە بنچینەی ئەو خەسڵەتە پیسە بریتیە لە وەلانانی تەرازووی خواو پێغەمبەرﷺ بۆ هەڵس و کەوت کردن و، دانانی تەرازوویکی دیکەی لاتەل.

بەڵێ، مسوڵمان:

تیرەو گەل و نیشتیمانی خوی خۆش دەوێ، بەلام نایان پەرستێ، خۆشی دەوێن بەلام خۆشەویستی وان وای لێناکات بیانکاتە تەرازووی هەڵس و کەوت و جۆرو چۆنیەتی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵك داو، دۆستایەتیو دوژمنایەتیو (الموالاة والمعاداة)ی لەسەر بنیات نانێ!

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە هیچ کاتێك شانازێ بەتیرەو نەتەوەو ڕەچەڵەکییەوە ناکات و خۆی پێوە هەڵناکێشێ، (ابي عقبة)ش کە کابرایەکی فارس بووەو یەکێك بووە لەهاوەڵانی

٢- هەرچەندە گەل و تیرە پەرستیش هەر لە غەریزەی خوشەویستی گەل و نیشتیمانەوە پەیدادەبێ، بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە حوکمی هەردووکیان وەك یەك بێ، ئایا ئەو کەسەی کە لەڕێی زیناو داوێن پیسی‌یەوە غەریزەی جینسی‌ی تێر دەکات وەك ئەو کەسە وایە کەلە ڕێ‌یەکی حەڵاڵ و زەڵاڵەوە تێری دەکات؟!

دیارە نەء، بەڵام خۆ هەردووکیشیان هەر لەسەر غەریزەی جینسی‌یەوە هەڵدەستن!!

دەجا حەرام کردنی سۆزی نەتەوایەتی -لەسنووری خۆیدا- لەبەر ئەوەی هەندێك جاران سەردەکێشێ بۆ ڕەگەزپەرستی‌و خاك و ئاوپەرستی، ڕاست وەك بەحەرام حسێب کردنی ژن هێنانی شەرعی‌و حەلاڵە -کە بریتی‌یە لەتێرکردنی غەریزەی جینسی لەڕێی سرووشتی خۆیەوە- چونکە هەندێك جاران دیاردەی زیناو داوێن پیسی بەهۆی ئەو غەریزەیەوە سەر هەڵدەدات!!

ئێستا کەزانرا هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بەمەسەلەی خۆشەویستی گەل و نیشتیمان چۆنە، بابچینە سەروکاری مەسەلەیەکی دیکە:

## دووەم: ڕای ئیسلام سەبارەت بەداب و دەستوورو خوو و نەریتە نەتەوایەتی‌یەکان

لەم بارەوە هەڵوێستی ئیسلام ئاوایە:

هەرچی لەگەڵ یەکێك لەبەندو یاساکانی ئیسلامدا دژایەتی نەبێ، -ئەوەت لەیادبێ کە گوتمان ئیسلام بەپێی سرووشتی ساغی مرۆڤ دانراوە- ئەوە ئیسلامەتی بەشتێکی ڕەواو

---

پێغەمبەرﷺ، دەفەرمووێ: لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دا لەجەنگی ئوحوددا ئامادە بووم، زەبرێکم لەکابرایەك لەبت پەرستەکان داو گوتم: بیگرە لەدەستم و منیش کوڕێکی فارسم! پێغەمبەرﷺ ئاوڕی لێ دامەوەو فەرمووی: دەبوو گوتبات: بیگرە لەدەستم و منیش کوڕێکی ئەنصاریم(**)!!

(*) بڕوانە: فیض القدیر، ب٥، ل٣٨٦.

(**) بڕوانە: سنن ابي داود، ب٢، ل٦٢٥.

ماقووڵی دەزانیٚ‌و، بەپێچەوانەوە هەرچی دژ بەیەکێك لەیاساو دەستوورەکانی ئیسلام بێت ئەوە لەتەرازووی بەرنامەی خوادا بێ کێش و سەنگە.

بۆ وێنە: جل و بەرگی کوردی ڕەسەن[1] چ پیاوانەو چ ژنانە، شتێکی لەبارو گونجاوە لەگەڵ یاساکانی ئیسلام داو، ئەوە هیچ کە ئیسلام لە فەوتاندنی ناخەفتێ، بگرە مانەوەی بەپێویستیش دەزانێ، بەلاّم عادەتێکی پووچی وەك ڕەش بەڵەك -کەلەو بڕوایەش دا نیم نەریتێکی نەتەوەیی گەلی کورد بێ- ئیسلام دژایەتی دەکات و پێی ڕازی نیە.

## سێیەم: سەبارەت بەزمان و ئەدەب و کەلەپووریش ڕای ئیسلام وایە

لەدەمی وەرگرتنی یاسای چوارەم دا -کە هەتا ئێستاش هەر خەریکی شیکردنەوەی ئەو یاسایەین- گوتمان: مرۆڤایەتی بەپێی ویستی خوا دابەش بووە بۆ چەند گەل و تیرەیەك، دواییش ڕوونمان کردەوە کە هەبوونی نیشتیمان و زمانێکی سەربەخۆ شتێکی پێویست و حەتمیە بۆ بە نەتەوە حسێب کرانی هەر گەل و نەتەوەیەك، مادام وابێ زمانی هەر گەلێك -جا بەهەر شێوەیەك کە پەیدا بووبێ- بەویست و خواستی خوای پەردوەردگار هاتۆتەدی.

تەنانەت خوای زانا لەسورەتی (الروم)دا فەرموویەتی ﴿ومن آياتِهِ خَلْقُ السمواتِ والأرضِ واختلافُ ألسِنَتِكُم وألوانِكُم إن في ذلك لآياتٍ لِلعالِمين﴾ (٢١)، واتە: وەلە نیشانەکانی -گەورەیی خوا- درووست کرانی ئاسمانەکان و زەوی‌و جیاوازی زمان و ڕەنگتانە، بەڕاستی لەوەدا نیشانەو بەڵگەی زۆر هەن -لەسەر هەبوونی خوا- بۆ زانایان.

لێرەدا دەبینین خوای کاربەجێ جیاوازی ڕەنگ و زمانی نەتەوەو گەلەکانی کردۆتە نیشانەو بەڵگەی هەبوونی خۆی.

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە، ئایا بابایەکی مسوڵمانی کورد کەبیەوێ بەرنامەی خوا بۆ گەلەکەی ڕوون بکاتەوە، بەبێ شارەزایی‌و بەڵەدی لەزمان و ئەدەبی کوردیدا ئەمەی بۆ دەکرێ؟!

---

[1] بۆیە دەڵێین (ڕەسەن) چونکە ئێستا -حەیفێ- لەئەنجامی لاساکرنەوەی کوێرانەی مسوڵمانەکان!! جۆرە جل و بەرگێکی بەناو کوردانەی نارەسەن و بێ شەرمانەی ئافرەتان پەیدا بووە، کە هیچی وای لەجل و بەرگە بێشەرمانەکەی ڕۆژهەلاّتی‌و ڕۆژئاواییە ئاژەڵ سیفەتەکان کەمتر نیە!!

کەواتە: لەڕاستی‌دا خزمەتکردن بەئەدەب و زمانی هەر نەتەوەیەك بەجێ هێنانی یەکێکە لەیاساکانی ئیسلام، مادام ئەو ئەدەب و زمانە بەکاربهێنرێ بۆ ڕوون کردنەوەو خستنە ڕووی ئیسلام، یان هەر زانیاری‌یەك کە سوودمەند بوونی گەڵ تێدابێ.

کەواتە: پوختەی قسان ئەوەیە کە ئیسلام دژی هیچ جۆرە زمان و ئەدەبێك نیە، چونکە وەك گوتمان ئەو زمانانە بەپێی ویستی خودا هاتوونە دی‌و، بەڵگەن لەسەر هەبوونی خوا، وێڕای ئەمەش زمان و ئەدەبی هەر گەلێك دەگونجێ بەکار بهێنرێ بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی ئیسلام و هەر زانیاریی‌یەکی سوود بەخش.

جا بەپێی یاسای (ما لایتم الواجب إلا به فهو واجب) واتە: (ئەو شتەی کە فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ ئەویش پێویستە)، دەتوانین بڵێین: خزمەتکردن بە ئەدەب و زامان لەڕوانگەی ئیسلامەوە پێویستە، چونکە زمان و ئەدەبێکی ڕێك و پێك و تەواو، بەبێ مشـوور لێخواردن نایەتە دی‌و بەبێ زمان و ئەدەبێکی تەواویش ناتوانین خزمەت بەئیسلام بکەین و بەچاکی رایبگەیەنین، هەڵبەتە ڕاگەیەنرانی ئیسلامیش پێویستە، کەواتە:

هێنانە دی‌ی زمان و ئەدەبێکی ڕەسەن و تەواو لەنێو هەر گەلێکدا پێویستە، بەلاَم لێرەدا تێبینی‌یەك هەیە ناگونجێ فەرامۆش بکرێ، ئێمە کە دەڵێین: هەوڵدان بۆ هێنانەدی ئەدەب و زمانێکی تەواوو ڕەسەن لەنێو هەر گەلێکدا پێویستە، نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە مەبەستی ئێمە لەئەدەبی ڕەسەن ئەو ئەدەبەیە کە لەگەڵ یاساکانی بەرنامەی خوادا دژایەتی نیە، ئەو ئەدەبەش کە لەگەڵ پەیڕەوو شەرعی خوایی‌دا ناکۆکی نیە، دەتوانین بەکورتی بڵێین: ئەدەبێکە دەبێتە پاڵنەری مرۆڤ بەرەو چاکەو خێر خوایی‌و خزمەتکردنی خەڵك، کەواتە: هەر ئەدەبێك بە پێچەوانەی ئەمەوە بێت ئەوە ئەدەبێکی نارەسەن و ناشەرعی‌یە، چونکە لەگەڵ بەرنامەی خوادا دژایەتی هەیە.

(لێرەدا برێك بێدەنگ بووم و ژوورەکەمان بێ هەست و خوست بوو، بەلاَم دەنگی یەکێك لەدانیشتوان خامۆشی ژوورەکەی ڕەواندەوەو گوتی:)

ئەرێ پێم وابێ تەفسیری ئایەتەکە برێکی ماوە!

گوتم: بەڵێ، ئەوە گوتم پشوویەکی بدەم و بشزانم داخوا ماندوو و بێ‌تاقەت بوون!

گوتی: کاکە ماندوو بوونی چی؟ بەقەرارێ پیاوان ئەمن بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر هەتا بەیانی دابنیشم بێ‌تاقەت نابم.

(ئینجا دانیشتووانی دیکەش یەك دەنگ گوتیان:)

کاکە گیان ماندوو بوونی چی؟ ئێمە لەمێژ ساڵە ئەو گرفت و گرێ کوێرانەمان لەسەر دڵ کۆ بوونەتەوەو لەدەرفەت و هەلێکی ئاوا دەگەڕاین کەیەکێك هەبێت بتوانێ بەخێرا خۆی بۆمان بکاتەوە، گوتم: مادام وابێ زۆر چاکە، بابچینەوە سەر توێژینەوەو لێکدانەوەی پاش ماوەی ئایەتەکە.

٥- پێنجەمین یاسا کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دێتە بەرچاو، ئەوەیە کە دابەش بوونی مرۆڤایەتی بەسەر چەند تیرەو گەلێکدا، بەمەبەستی پەیداکردنی هۆگریو تەبایی و خۆشەویستی یە لەنێوانیاندا، نەك ڕق و قین و دووبەرەکیو دوژمنایەتی، ئەم یاسایەش لەوشەی ﴿لتعارفوا﴾ دەستگیر دەبێت.

بەڵێ ئیسلام دەڵێ نابێ جودایی ی تیرەو هۆزو گەلەکان، ببێتە هۆی ناکۆکیو تێك هەڵپڕژان و وێك هەڵنەکردن و پێکەوە مەدار نەکردنیان، ئینجا ئەلێرەشدا پێویستە ڕاستی یەك ڕابگەیەنرێو تەئکیدی لەسەر بکرێ:

ئیسلام هەر هێندە خۆشەویستیو سۆزی نەتەوایەتی بەغەریزەیەکی ڕەسەن و شتێکی سرووشتیو ڕەوا لەقەڵەم دەدات، کە لەرێی (تعارف)دا نابێتە پەرچ و تانە، بەڵام کاتێك ئەو سۆزە نەتەوەیی یە ڕێ لەبرایەتیو یەکترناسین دەگرێو، دەبێتە ماکی ناکۆکیو دووبەرەکیو لێك دان و پێك دادان، ئەوا ئەو دەمی هەڵوێستی ئاوبراو نەك هەر بەشتێکی شەرعیو ڕەوا دانانێ، بەڵکو بەکوانێك [1] و خۆرکەیەکی ترسناکی دادەنێت، ئەمەش سنووری نێوان نەتەوایەتی ئیسلامیو نەتەوایەتی نائیسلامیو نەفامی یە.

ئیسلام ڕێ لەهیچ ئینسانێك ناگرێ کە گەل و نیشتیمانەکەی خۆی خۆش بوێو پیێ هەڵا بڵێ، چونکە ئیسلام دەزانێ کەسۆزی مرۆڤ سەبارەت بە گەل و نیشتیمانی شتێکی ڕەسەنە لەسرووشتیدا، بەڵام بەدوو مەرجی گرنگ:

(ا) خۆشەویستی یەکە لەئەندازەی ماقووڵی خۆی دەرنەچێو لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە نەبێت، سادەتر بڵێین: گەل و خاك و ئاوەکەی نەکاتە بت و سەنەم و لەجیاتی خوا نەیان پەرستێ.

---

[1] کوان: دوومەڵ.

(ب) لەو خۆشەویستی‌و سۆزەی لەمپەرو چەپەرێك دروست نەكات كە ببێتە هۆی گۆشەگیر كردن و دابڕانی گەلەكەی لەكۆمەڵگای بەرفراوانی مرۆڤایەتی، بەواتایەكی دیكە: نابێ سۆزی نەتەوایەتی وای لێ بكات بەس خۆی بێتە بەرچاوو كەسی دی بە بیردا نەیەت و، لەقاوغ و قەپێلكی نەتەوایەتی خۆی‌دا خۆی كۆشمەڵە بكاو، هەست بە بوونی كەسی دیكە نەكات، یان ئەگەر هەستیشی پێ بكات بەكەم وكورت و ناتەواوی حسێب بكات[1].

---

[1] دەتوانین بڵێین مەسەلەی خۆشویستنی گەل و نیشتیمانیش وەك زۆر مەسەلەی دیكە پێنج حوكمە شەرعی‌یەكان (الأحكام الشرعية الخمسة)ی بەسەردا دەچەسپێن:

چونكە لەحاڵێكدا خۆشویستنی گەل و نیشتیمان و بەرگری لێكردنیان مەرج و پێویست بێ بۆشتێكی فەرزو پێویست وەك بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوا، ئەوا پێویست (فرض) دەبێ، چونكە (مالايتم الواجب إلا به فهو واجب).

وە لەحاڵێكدا كەبەڕێوەبردن و هێنانەدی سوننەتێك پەكی لەسەر خۆشویستن و پاراستنی گەل و نیشتیمان بكەوێ، بۆ وێنە كابرا بۆیە گەل و نیشتیمانەكەی خۆی خۆش بوێن چونكە پێغەمبەرﷺ وای كردوە، ئەوە دەچێتە قاڵبی سوننەت (مندوب)ەوە.

بەڵام ئەگەر هیچ حوكمێكی پێویست یان سوننەت پەیوەندی بەو خۆشویستنەوە نەبێ ئەوا هەر لەسەر ئەسڵی خۆی كە (إباحة)یە دەمێنێتەوە، چونكە (الأصل في الأشياء الإباحة). بەڵام ئەگەر هاتو خۆشەویستی‌یەكە سەری كێشا بۆ شتێكی ناپەسەند (مكروه) وەك بەچاكتر دانانی گەلەكەی‌و ئمتیاز پێدانی بەسەر گەلانی دیكەدا، بەمەرجێك نەگاتە ڕادەی دەمارگیری‌و ڕەگەزپەرستی دەنا حەرام دەبێ، ئەوا ئەو جۆرە خۆشەویستی‌یە حوكمی (كراهية) وەردەگرێ.

وەئەگەر هاتو خوانەخواستە خۆشەویستی‌یەكە مرۆڤی پەلكێش كرد بۆ شتی حەرام وەك (سوێند پێ خواردن)و (وەك ئایین لەقەڵەم دان)و (دەمارگیری‌و ڕەگەزپەستی)و... هتد ئەوا لەو حاڵەتەدا خۆشەویستی‌یەكە حەرام دەبێ‌و، جاری وایە دەبێتە هۆی كافر بوون و وەرگەڕانیش.

ئەمەش چەند نموونەیەك:

لەو قسەو تەعبیرانەی كە بوونەتە بنێشتە شینكەی سەرزاری زۆر كەسی (كورد پەروەر!!)و دەبنە هۆی گوناهباربوون و، بەڵگەی لەئیسلام و شەرع بێ‌هەواڵ بوونی خاوەنەكانیشیان: "سوێند بەكوردستان"، "بەسەری فلان كەس* "، "بەگۆڕی فلان كەس*"، "دینمان ئایینمان هەر نیشتیمان"... هتد.

---

* كە سەركردەیەكی نیشتیمانی یان هەركەسێكی دیكە بن، چونكە سوێند بەغەیری خواو سیفاتەكانی (شيرك)ە.

٦- شەشەمین یاسای ئەم ئایەتە قورئانییە، ئەوەیە: کە پێوەری گەورەو بچووکیو تەرازووی گرانیو سووکی لەئیسلامدا بەس تەقوایە.

بەواتایەکی دیکە: گۆڕەپانی ئەسپ تێدا تاودانی ئینسانەکان لەپێشبڕکێ (مسابقة)ی ژیانی دنیایاندا، بریتییە لە پابەندی بە بەرنامەی خواوە.

ئەم یاسایەش لەڕستەی ﴿إن اكرمكُم عِند الله اتقاكم﴾[1] دەسگیر دەبێ.

جا برادەران ئەم یاسایە یەکجار گرنگ و بەرزەو پێویستی بە سەرنج لێدان و تێوەڕامانێکی ورد و قووڵ دەکات چونکە:

ئیسلام کاتێ خۆی کە نێررا، بۆیە نێررا، مرۆڤایەتی لەچنگ ئەو پێوەرو تەرازووە لەنگ و لاتەڵ و گچکانە ڕزگار بکات کە بیروبۆچوون و هەواو ئارەزووی مرۆڤانەی خۆیان پەیدای کردوون بۆ کێشانەو پێوانەی شتان.

.. هات تاکو لێیان حاڵی بکات کە هیچ کام لە: جینس و ڕەگەزو نەتەوەو داراییو ڕەنگ و زمان و وەچاخ و بنەماڵەو... هتد لە بارانیاندا نیەو بۆ ئەوە ناشێن بکرێنە پێوەری هەڵسەنگاندن و نرخاندنی چاکیو خراپی ئینسانان.

هات تاکو تێیان بگەیەنێ کە هیچ کەس ئیمتیازو زیادی بەسەر یەکێکی دیکەدا پەیدا ناکات لەسۆنگەی ئەوەوە کە:

- نێرەو مێ نیە، یان مێیەو نێر نیە.
- ئارییەو سامی نیە، یان سامییەو ئاری نیە.
- عەجەمەو عارەب نیە، یان عارەبەو عەجەم نیە.
- دەوڵەمەندەو نەدار نیە، یان نەدارەو دەوڵەمەند نیە.
- سپییە ڕەش نیە، یان ڕەشەو سپی نیە.
- بەعارەبی دەدوێ بەکوردی نا، یان بەکوردی دەدوێو بەعارەبی نا.

---

[1] التقوى): جعل النفس في وقاية مما يُخاف، وفي اصطلاح الشرع: حفظ النفس عما يؤثم، واتە: تقوى) لە زماندا، خۆپاراستنە لەو شتانەی کە جێی مەترسین، لەزاراوی شەرعیش دا، بریتییە لە خۆپاراستن لەو شتانەی کە ئینسان پێیان تاوانبار دەبێت، تەماشای (معجم مفردات الفاظ القرآن)ی راغب الأصفهاني، بکە، ل٥٦٨.

• شێخ و سەییدەو ڕەشۆکی نیە، یان ڕەشۆکی‌یەو شێخ وسەیید نیە.
• ئاغاو بەگەو مسکێن نیە، یان مسکێنەو ئاغا و بەگ نیە[1].

بەڵێ! ئیسلامەتی هات تا لەگوێی هەموو مرۆڤایەتی‌دا بچکێنێ، کە لەسەر بنچینەی: جینس و ڕەگەزو نەتەوەو ئابووری‌و ڕەنگ و زمان و بنەماڵەو... هتد ڕەواو ماقووڵ نیە دەستەیەک ژووڕاترو باڵاتر دابنرێ لەباقی مەردووم، چونکە هیچ کام لەو پێوەرانە کەڵکی ئەوە ناگرێ چاکی‌و خراپی‌و بەرزی‌و نزمی مرڤایەتی پێ بزانرێ، بەڵێ ئەو ڕێچکەو کوێرە ڕێیانەی کە ئینسان بەگوێرەی بۆچوونی وان لە ئاژەڵ بەرزترو چاکتر نیە، ڕێی تێ دەچێ ئەو پێوەرو تەرازووانە بۆیان دەست بدەن، چونکە مرۆڤ کە لە ئاژەڵ جوێ نەکرایەوە، هەموو ئەو خەسڵەتە تایبەتی‌یانەی کە ئیمتیازی بۆ پەیدا دەکەن بەسەر ئاژەڵدا لەدەستیان دەدات، ئەو دەمەش هەر ئەو خەسڵەتانەی تێدا دەمێنێتەوە کە ئاژەڵەکان تێیاندا بەشدارن، جا ئەو کاتەش ئەو پێوەرانە هەروەک چۆن بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ئاژەڵانیان دەست دەدا، بۆو جۆرە مرۆڤانەش دەست دەدەن و دەگونجێن!!

بەڵێ! ئەودەمی هەروەک چۆن بۆت هەیە بڵێی: گاو ئەسپ لە مانگاو ماین چاکترن، چونکە بەهێزترو بەدەو ترن، بۆشت هەیە بڵێی: پیاو لە ئافرەت باشترە چونکە بەهێزترەو بەکارترە. وە بۆت هەیە بڵێی: ئینسانە سپی پێستەکان لە ڕەش پێستەکان باشترن، هەروەک چۆن مراوی سپی لە ئی ڕەش بەرمێن ترو چاکترە.

جا نازانم کەسێك هەر لوێچێك ژیری‌و لێکدانەوەی هەبێت، چۆن بەم جۆرە هەڵسانگاندنە ڕازی دەبێت.

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەئیسلام لەهیچ کام لەو پێوەرانە ڕانابینێ بتوانن چاکی‌و خراپی‌و بەرزی‌و نزمی مرۆڤەکان بخەنەڕوو، سەرلەبەریان بە کەم و کورت و هەڵەو پەڵە لەقەڵەم دەدات.

---

[1] لەڕاستیدا هەرکام لەزاراوەی: شێخ، ئاغا، بەگ، لەلایەکەوەو زاراوەی: مسکێن، ڕەشۆکی، لەلایەکی دیکەوە، لەفەرهەنگی ئسلامدا نین ولەڕژێمی قڕی‌و پڕی‌و چینایەتی‌دا لەدایك بوو ون، هەڵبەتە وشەی (المسکین) لەقورئاندا هەیە، بەلاَم لەقورئانی‌دا مەبەست بابای نەدارە، نەك نیوەکاری ئاغاو میرو شێخ!!

ئێستاش بابچینە سەروکاری بەرنامەی خواو بزانین پێوەری هەڵسەنگاندی ،مرۆڤەکان لەوێ‌دا چی‌یە:

بە کوردی‌و بە کورتی دەڵێین:

پێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسان و نرخاندنی لەبەرنامەی ئیسلام دا هەر خودی ئینسانە و هیچی‌دی !!

بەڵێ ئیسلام کەنەمامی دەستنیژی خودایە، سەیری ئەوە ناکات داخوا ئەو ئینسانە، نێرە یان مێ‌یە، ئاری‌یە یان سامی، کوردە یان تورك، دارایە یان نەدار، سپی‌یە یان ڕەش، فارسی زمانە یان هیندی، شێخە یان ڕەشۆکی، بەڵکو جیٚ‌ی تێوەڕامانی ئیسلام، بەس خودی ئینسان خۆیەتی بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ شتێکی دیکە.

بۆیە ئیسلام کەسایەتی‌و خودی ئینسان لەبیرو باوەڕو ڕەفتارو کردارەکانی‌دا دەبینێ، تاقە بیرو بیرو باوەڕو ڕەفتاریش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە کە خوای زانا بە (محمد)ی‌داﷺ ناردوویەتی.

کەواتە: مەیدانی پێشبڕکێ‌و تەرازووی هەڵسەنگاندن بیریتی‌یە لە: (مسوڵمانەتی) کە لەم ئایەتە بەڕێزو پێزەدا وشەی (تقوی)ی بۆ بەکار هێنراوە.

کەواتە: هەر کەسێك مسوڵمانتر بێ‌و زیاتر گەردن کەچی پەیڕەوی خودا بێت، مرۆڤێکە چاکترەو لەلای خوا ڕێز لێ گیراوترە، وەبەپێچەوانەشەوە هەتا مرۆڤ نامسوڵمان تر بێ‌و کەمتر پابەندی ئایینی خوا بێت، مرۆڤێکی خراپترەو لای خواش بێ‌نرخ ترو سووك ترە.

ئێستاش کەزانرا پێوەری پێوان و تەرازووی کێشانی مرۆڤان لەئیسلامدا چی‌یە، بابزانین هۆی هەڵبژاردنی ئەو پێوەرو تەرازووە چی‌یە؟!!

ئیسلام، لەسۆنگەی ئەوەوە کەمرۆڤێك داینەناوە هەواو ئارەزوو بیخاتە بەر تین و تەوژمی خۆیەوەو کەرەتێك بەلای پیاودا[1] بیشکێنێتەوەو کەرەتێك بەلای ئافرەت دا[2] ، یان جارێك بەلای

---

[1] وەك فەیلەسووفەکانی یۆنان دەیان کرد، تەنانەت لەوەدا مشت و مڕیان بوو، ئایا ئافرەتیش وەك پیاو ئینسانە یان نا!!

[2] وەك ئەوانەی کەبەناو لەسەر ئافرەت دەکەنەوەو بەرگری لێ دەکەن! ئەمما لەڕاستی‌دا دەیانەوێ لەمرۆڤایەتی‌ی بیشۆرێنن و لەڕەوشتی بەرزی بتۆرێنن!!

فلأن ڕەگەزدا ڕای بکێشیّو جارێك بەلای فیساردا، یان دەمێك بەلای فلأن گەلدا پالّی بداو دەمێك بەلای فیساردا، یان کەرەتێك بەلای چینی بورژوادا تاوی بداو کەرەتێك بەلای پرۆلیتاری‌دا، یان تاورێك بەلای فلأن ڕەنگدا هەلّی پێچیّو تاوێك بەلای فیساردا... یان... یان... هتد.

نەخێر ئیسلامەتی مرۆڤ نەی ناردوە، تا هەر تاوەو هەر جارە ڕەشەبای هەواو ئارەزوو و بۆچوونی مرۆڤانەی بەلایەکدا ڕەپێچەکی بدات.

بۆیە ئیسلام بۆ دەرخستنی باشیّو بەدیّو بەرزیّو نزمی بەندەکان زەمینەو گۆڕەپانێکی هێندە بەرین و فراوانی سازداوە کە تێکڕا جیّی هەمووانی تێدا وەبێ بەبێ جیاوازی.

... هەر کام لەو پێوەرو تەرازوانەی زادەی بیرو بۆچوونی مرۆڤانن، وەك دەلاقەیەکی گچکە وایە، کەیەکێك لێیەوە تەماشای مەزرایەکی پان و بەرین دەکات، بەلأم لەبەر تەسکیّو گچکەیی مەودای دیتنی سەرتاپای مەزرایەکە ناداو، بەس گۆشەو سووچێکی لێ دەبینێ.

بابزانین بۆچی؟!

• جینس بکە بەتەرازوو و پێوەر هەر جارەی نیوەی مرۆڤایەتی تێدەچێ.

• ڕەگەز بکە بە پێوەر تاوێك ئاری دادەکەون، تاوێك سامیّو... هتد.

• نەتەوەپەرستی بکە بە سەنگی مەحەك، مرۆڤایەتی دەبێتە هەزارو یەك دەستەو وەك ئاردی نێو دڕوانی لێ دێ!

• هەرکام لە ئابووریّو ڕەنگ و زمان و وەجاخیش هەر بەو پێودانە.

بەلأم پێوەرو تەرازووی ئیسلام وەك پەنجەرەیەکی گەورە وایە کە لەیەك کاتدا دەتوانی سەر لەبەری مەزرایەکەی تێڕا بەدی بکەیّو لێی وورد بیەوە، ئیسلام کە دەلّێت: کامەتان مسولّمانترو پارێزکارتر بن، ئەو کەسە لەلای خوا بەڕێزترو لەپێش ترە، دیارە مەیدانی پێشبڕکە (مسابقە)ی مرۆڤەکانی هێندە بەرین کردووە کە جیّی هەمووانی تێدا ببێتەوە، چ نێر بن چ مێ، چ ئاری بن چ سامی، چ عەجەم بن چ عارەب، چ دەولّەمەند بن چ نەدار، چ سپی بن چ ڕەش، چ مسکێن و عەوام بن چ ئاغاو شێخ[1].

---

[1] دووپاتی دەکەینەوە کە وشەی (ئاغا، شێخ، بەگ، میر، ڕەشۆکی، عەوام، مسکێن) ئەگەر بەو ئیعتیبارە بەکار بهێنرێن خەلّك چین چین و توێژ توێژەو هەندێکیان هەر بە ڕەچەلّەك و وەجاخ بەرزو گەورەن!! وەك (ئاغاو شێخ و میرو بەگ)ە کان و هەندێکیش ئەگەر سەریان بگاتە کەهکەشانی فەلەك

٧- یاسای حەوتەم: لە وشەی ﴿عند الله﴾ی نێو ڕستەی ﴿إن اكرمكم عند الله اتقاكم﴾ وەردەگیرێو، دەتوانین ئەوا تەعبیری لیٰ بدەینەوە: بەس پەروەردگار شیاوی ئەوەیە ڕێز لەبەندەکانی بگریٰ، یان بەپێچەوانەوە بیٰ حورمەتیان بکات!

واتە هەر کەسێك لە تەرازووی خوادا جیٰی ڕێزو حورمەت و ئیعتیبار بوو، ئەوە جیٰی خۆیەتی بە ئینسانێکی چاك و بەڕێز دابنریٰ، وەهەر کەسێکیش لەلای خواو بەپیٰی بەرنامەی وی سووك و بیٰ حورمەت بیٰ ئەوە پێویستە بە سووك و بیٰنرخ تەماشا بکرێو لە هیچ حالآندا سەرنجی ئەو شتانە نەدریٰ کە لەتەرازووی خوادا بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵکی جیٰی ئیعتیبار نین.

خوای بەرزو مەزنیش دەربارەی ڕێگەو چۆنیەتی ڕێزو حورمەت وەدەست هێنان فەرموویەتی ﴿من كان يريد العِزة فَللهِ العزةُ جَميعاً إلَيه يَصعَدُ الكَلِمُ الطيبُ وَالعَمَل الصالح يَرفَعُهُ..﴾ فاطر (١٠).

---

هەر بە ڕەچەڵەك نزم و کەم و سووکن کە (مسکێن و عەوام و نەدار)ەکانن ئەوا بێگومان هەر کام لەم ناوانە بەهەڵەو بیٰمەعنا لەقەڵەم دەدرێن، چونکە وەك لەلاپەڕەکانی پێشوودا گوتمان تەرازووی گرانیو سووکیو سەنگی مەحەکی چاکیو خراپی لەڕوانگەی ئیسلامەوە بەس پارێزکاری (تقوى)و مسوڵمانەتیيە لەبەر ئەوەی کە ڕەچەڵەك و بەرە باب و باقی شتەکانی دیکە کەڕەنگ و زمان و سامان و...هتد هیچیان بەویستی مرۆڤ پەیدانابن و نازایەتی یان نانازایەتی ئینسانیان تێدا نیە، ئینجا هیچ ماقووڵیش نیە مرۆڤ بەشتێك خراپ یان چاك بیٰ کە هیچ دەستی لە بوون و نەبوونیدا نەبووە!!

بەڵام ئەگەر بەو ئیعتیبارە بەکار بهێنرێن کە ئەم ناوانە چەند ئیعتیبارێکی عورفی نێو کۆمەڵگان و هیچ پەیوەندییان بەچاکیو خراپی خاوەنەکانیانەوە نیە ئەوە شتێك نیە، بەڵام نابیٰ لەوەش بیٰ هەواڵ بین کە وشەی (شێخ) کە کاتی خۆی ڕەواجی پەیداکردووە نازناوی ئەو مامۆستاو ڕابەرو چارساغە خواییيانە بووە کە میراتی پێغەمبەرﷺیان پاراستووەو خەڵکیان ڕێڕوونی کردوە، دیسان وشەی (ئاغا، میر، بەگ) شۆرەت و نازناوی ئەو براگەورەو فەرمانڕەوایانە بوو ون کەخەڵك لەنێو خۆیاندا هەڵیان بژاردوون تاکو سەرپەرشتیان بکەن، بەڵام دوایی ئەرکی هەر کام لەشێخ و میرو بەگ و ئاغا بۆتە شتێکی میراتیو کراوەتە دەستەواژە (وسيلة)ی خۆ پیٰ ژیاندن و خەڵك چەوساندنەوەو فیرعەونایەتی کردن. (هەڵبەتە بێجگە لەچەند حاڵەتێکی کەم و ڕیزپەڕ.

وە دەربارەی هۆی بێ ڕێزیو بێ قیمەت بوونیش فەرموویەتی ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ..﴾ الحج (١٨).

وەك دەبینین لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (فاطر)دا خوای زانا بێ پێچ و پەنا خستوویەتیە ڕوو کە هەر کەسێك بەدووای عیززەت و سەربەرزیو ڕێزو حورمەتی دنیاو دواڕۆژدا دەگەڕێ، بابزانێت کە هەمووی لەلای خوایە!

ئینجا ڕێگەی وەدەست هێنانیشی لەدوو شتاندا دەخاتە ڕوو:

یەکەم: قسەی چاك (الكلم الطيب) کە زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە وشەی خوا بەیەکگرتن (كلمة التوحيد)ە، کەواتە: (لا إله إلا الله).

دووەم: کردەوەی چاك (العمل الصالح)، کە بریتیتە لە ڕەفتار بەگوێرەی (لا إله إلا الله)!!

وە لەئایەتی ژمارە (١٨)ی سوورەتی (الحج)دا دوای ئەوەی ڕای دەگەیەنێ کە تێکڕای بوونەوەر، واتە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە لە ڕۆژو مانگ و ئەستێرەو شاخەکان و درەخت و گیاندارەکان و زۆر لەخەڵکی فەرمانبەری خوا دەکەن و کڕنووشی گەردن کەچیی بۆ دەبەن، وەدوای ئەوەی دەیخاتە ڕوو کەزۆر کەسیش هەیە لەخوا یاخی دەبێو خۆی بەزل دەگرێو کڕنووش بۆ خوا نابات و بەو ڕەفتارەشی خۆی وا لێ دەکات شایستەی سزاو جەزرەبەی خوا بێت، دەفەرموێ ﴿وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ..﴾، وە هەرکەسێك خوا زەبوونی بکات هیچ کەس نیە ڕێزی لێ بنێ!

بەڵێ! کڕنووش بۆ خوا نەبردن و لە خوا یاخی بوون ماکی زەبوونیو ڕیسوایی دنیاو دواڕۆژە! کەواتە برادەران!

ئەوەی کە ئیسلام کردوویەتی بەلووتکەی هەرە بەرزی ئامانجی پێشبڕکەی مرۆڤەکان و، ئەوەی کە کردوویەتی بە مایەی سەربەرزیو ڕووسووری دنیاو دواڕۆژان، بریتییە لە وەدەست هێنانی ڕێزو حورمەت و قەدرو قیمەت لە خزمەت خوادا، وە تاقە ڕێی وەدەست هێنانی ئەو ئامانج و مەبەستە بەرزو پیرۆزەش بریتییە لە پارێزکاریو کڕنووش بۆ خوا بردن و فەرمانبەری بۆ کردنی.

ئینجا گومانیشی تێدا نیە کە ئامانجی ناوبراوو ڕێگەی پێگەیشتنیشی شتێکن هەموو کەس دەستی وێرا دەگەن و، هیچ کەسیش لە هیچ کەس زیاتری بەش پێوە نین و بۆ هەموو کەس

وەك یەكن، كەواتە هەی لەوەی ئازا بیِّو پشك و بەشی زیاتری بۆ خۆی بڕ بدات و پلەو پایەی بەرز لەلای خوا دەستگیر بكات!
بەڵێ خێرو خۆشیو بەختەوەریی دنیاو قیامەتان لە گرەوی خواپەرستیو بەندایەتیدایە، هەروەك پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی (من أحب ان يكون اقوى الناس فلْيتوكل على الله تعالى، ومن أحب ان يكون اغنى الناس فليكن بما في يد الله عز وجل أوثق منه بما في يديه، ومن أحب ان يكون اكرم الناس فليتق الله عز وجل) رواه إبن أبي حاتم، واتە: كێ پێی خۆشە بەهێزترین كەس بێت، با پشت بە خوای بەرز ببەستێ، وە كێ پێی خۆشە دەوڵەمەند ترین كەس بێت، با بەوەی كە لەدەستی خوای بەرزو مەزن دایە متمانەدارتر بێت لەوەی كە لەدەستی خۆی دایە، وەكێ پێی خۆشە لە هەموو كەس بەڕێزتر بێت، با پارێز لەخوای بەرزو مەزن بكات.
جا برادەرینە!
ئێستا كە لە تەفسیری ئەو ئایەتە بەپێزە بووینەوە كە لە پێشەوە گوتمان: بەپشتیوانی خوا وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە دەداتەوە كە سەر بەمەسەلەی نەتەوایەتین و، پێم وابێ بە هەڵەشدا نەچوو بووم، حەز دەكەم بەر لەوەی بۆ دوایین جار لێك جوێ ببینەوەو كۆتایی بە وتو وێژەكەمان بێنین، بەخێرایی چاوێك بەو قسانەدا بگێڕینەوە كە تائێستا كردوومانن و ئینجا لە كۆتایی‌دا ڕامێنین بزانین چ ئەنجامێكی سرووشتیو ژیربێژی‌یان لێ وەردەگیرێ!
گوتیان: فەرموو! فەرموو!
گوتم: دەتوانین پوختەو ڕاپازنەراوی ئەو قسانەی تا ئێستا كردوومانن، لەچەند خاڵیكدا بخەینە ڕوو:

## پوختەی قسان لەچەند خاڵێك دا

### یەكەم:

كاتی خۆی كە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هاتوونە نێو نیشتیمانی كوردو غەیری كوردیش، وەك داگیركەرو چەوسێنەرێك نەهاتوون، كە ئامانجیان خۆ تێركردن و گیرفان پڕكردن بووبێت، بەڵكو وەك خواپەرست و مرۆڤ دۆستێكی بەویژدان و ڕەوشت بەرزو ئاشتی خواز هاتوون، بەئومێدی

ڕزگــارکردنی چەوســاوەو بەشــخوراوان، لــەژێر نــیری تــاغووت و ســتەمکاران، بەمەبەســتی چەسپاندنی حوکمی خوداو خەڵکی پێکەوە کردنە برا، بەئومێدی ڕازی کردنی خوا.

**دووەم:**

ئیسـلام نـەك هـەر کـاری خراپـی نەکردۆتـە سـەر گـەلی کـوردو گـەلانی دیکـەش، بـەڵکو بەپێچەوانەوە لەهەموو جۆرە بێ سەرەو بەرەیی‌و ناڕێکی‌و خراپەکاری‌یەك ڕزگاری کـردوون، لەهـەموو بوارەکـانی ژیـاندا، لـە بـواری پەرسـتن ڕزگـاری کـردوون لـە بـت پەرسـتی‌و ئەفسانەدۆستی‌و گەیاندوونیە بن سێبەری درەختی بەرزی پڕ پیت و پێزی خواناسی‌و زانست دۆستی.

لە بواری ڕامیاری‌دا لـە پەرتـەوازەیی‌و هـەزار پارچـەیی‌و بێ قـەوارەیی ڕزگـاری کـردوون و، هەمووی لەسەر یەك زەمینە بەپێی یەك بنەڕەت و بنچینە کردوونە براو کۆی کردونەوەو یـەك ئوممەتی مەزنی لێ پێکهێناون.

لەبواری کۆمەڵایەتی‌دا لەچینایەتی‌و ڕەوشت نزمی‌و ئافرەت کردنـە کۆیلـەو زینـدە بـەچاڵ کردن و هەزارو یەك دەردی دیکەی ڕزگار کردوون و پاکی کردوونەوە.

لەبواری ئابووری‌دا لەڕژێمی قڕی‌و پڕی‌و یـەکتر چەوساندنەوەو هـەژار ڕووتاندنـەوە، قوتـاری کردوون و خستوونیە بن سێبەری حوکمێکی ئیسلامی‌یانەی پڕ لە دادگەری‌و خێرو خۆشی.

وەهەروەها لەهەموو بوارەکانی دیکەی ژیاندا.

**سێیەم:**

هەبوونی چەند کەسـێکی ترسنۆك و دنیاپەرسـت و بـێ بڕسـت، لـەنێو زانـاو پێشـەوایانی ئیسلامدا، بەهیچ ڕەنگێك ڕەوا نیە بکرێتە بەڵگەی خراپی‌ی ئیسلام و لەبەرچاو کەوتنی زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلام.

**چوارەم:**

بەرنامەی ئیسلام نەك هەر ڕێ لەمرۆڤ ناگرێ کە نیشتیمان و گەلی خـۆی خـۆش بـوێ و بیـان پـارێزێ. بـەڵکو لەسەریشـی پێویسـت دەکـات و لێشـی داوا دەکـات! بـەڵام بەمـەرجێك ئـەو خۆشەویستی‌یە لەئەندازەی سرووشتی‌ی خۆی تێنەپەڕێ‌و نەبێتە بت پەرستی.

**پێنجەم:**

لەڕوانگەی ئیسلامەوە گەل و تیرەکان هەموویان یەکسانن وە هیچ گەل و تیرەیەك بۆی نیە بەنیازی ستەم کردن و چەوساندنەوە پێ لە سنووری نیشتیمانی گەل و تیرەیەکی دیکە بنێتە ئەو دیو.

**شەشەم:**

لەڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ کام لەڕەگەزو نەتەوەو ڕەنگ و زمان و دارایی‌و ڕەچەڵەك دروست نیە بکرێتە پێوەری پێوان و تەرازووی هەڵسەنگاندنی ئینسانەکان، بەڵکو تەنها مسوڵمانەتی‌و پارێزکردن و خواناسی سەنگی مەحەکی ناسینی بەندەکانە.

**حەوتەم:**

بەرزترین ئامانجی مرۆڤ لەم ژیانەی سەر زەوی‌دا، بریتی‌یە لە وەدەست هێنانی ڕێزو پایەی بەرزو ڕەزامەندی لەلای خوا.

وەدەست هێنانی ئەم ئامانجەش پەیوەستە بە جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکەوە کە خوای زانا بۆی دیاری کردوە، واتە: ئەرکی جێنشینایەتی، بەهۆی پارێزکاری‌و گەردن کەچی‌و فەرمانبەری‌یەوە.

ئێستاش بابزانین ئەنجامی سروشتی‌و مەنتیقی‌ی ئەمەی ڕابرد چی‌یە؟!

## ئەنجامی مەنتقی ئەم وتو وێژە

تاقە ئەنجامی سروشتی‌و ژیربێژی (منطقي)یانەی ئەمەی ڕابرد، ئەوەیە کە:

ئایین و بەرنامەی خوا تاقە بەرنامەیەکی ڕاست و هەمەلایەنەی ژیانە بۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتی، بەبێ جیاوزای، هەتا دنیا دنیایە.

وە بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ‌و توانیویەتی کە هێمنی‌و ئاسایش و دادگەری‌و تەبایی‌و یەکسانی‌و خۆش گوزەرانی‌و ڕەوشت بەرزی بۆ بەرەی ئادەمیزاد بهێنێتەدی.

وە بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ‌و توانیویەتی قەڵای کوفرو زۆرداری بڕووخێنێ‌و، مافی خوراوی چەوساوان بستێنێ‌و، تاغووت و فیرعەونان لەڕیشەوە بیخەوە دەرێنێ‌و بەرەو زبڵدانی مێژوو بیانڕەتێنێ.

وە تاقە بەرنامەیەکە کە بتوانێ ڕێزو حورمەتی زۆرو پلەو پایەی بەرزو ڕەزامەندی لەلایەن خواوە بۆ مرۆڤ فەراهەم بێنێ.

## بەکورتی:

ئیسلام تاقە بەرنامەیەکە کەبتوانێ مرۆڤ لەدنیاو دواڕۆژدا بەمراد بگەیەنێ‌و وەحەسێنێ.

کەواتە: با تەنها ڕوو بکەینە خواو بەرنامەی خواو، با بۆ چارەسەرکردنی هەموو گیرو گرفتێك و بۆ دەرمان کردنی هەموو دەردێکمان بەس پەنا بەرینە بەر خواو بەرنامەی خوا، بەشکم وڕێڕای چارەسەرکردنی گیرو گرفتان و ساڕێژ بوونی برینان و لاچوونی دەردان و سەربەرزی لەژیانی دنیادا، ڕەزامەندی‌و ڕێزو حورمەتی خوای زاناو بەرزو قسەلەجێ‌و کارزانیش لەژیانی دواڕۆژدا وەدەست بێنین.

وە با سەوورڕاو سووریش بزانین کە هەرچی ڕێچکەو بیردۆزەو کوێرە ڕێی مرۆڤکرد هەن تێکڕا کۆبکرێنەوە، بەهەموویان ناتوانن نە گەلی کوردو نەهیچ گەلێکی دیکەش بەئامانج بگەیەنن و لە مەینەتی دەری بێنن، چونکە ئەو بیردۆزە دەستکردانە بۆخۆیان دەردن، جا نازانم کەنگێ دەرد بەدەرمان شیاوە[1] ؟!

## قسەی کۆتایی دانیشتووان

خوا پاداشتت بداتەوە بەڕاستی چاکمان ماندوو کردی، بەڵام ئیشەڵڵا ماندوو بوونەکەت بەخۆڕایی نەبووە، چونکە بەڕاستی زۆر شت کە پێشتر بەراوەژووەوە لێی حاڵی بووبووین بۆت ڕاست کردینەوەو، زۆر گرفت و گرێ کوێرەی چەند ساڵەت بۆ کردینەوەو، پاش ئەوەی

---

[1] پێغەمبەری ڕابەرمان ﷺ فەرموویەتی (إن الله تعالى لَم يَجعَل شِفاءَكُم فيما حَرمَ عَلَيكُم) رواه الطبراني عن أم سَلَمة، وَرَمَز السيوطي لصحته، واتە: بێگومان خوای بەرز شیفاو چارەسەری ئێوەی لەشتێکدا دانەناوە کە لێی قەدەغە کردوون، بڕوانە (فیض القدیر)، ب٢، ل٢٥٢.

مەودایەکی زۆر لە پەروەردگاری بەخشندەو بەدەستەڵات دوور کەوتبووینەوە وات لێ کردین لێی نزیك بکەوینەوەو، سەرلەنوێ بە بەرنامەو ڕێبازی خوای بێ هاوتات ئاشنا کردینەوەو پێکەوە ئاشتت کردینەوە، دڵ و دەروونی ڕەش داگەڕاوو بەگومانی بەدو دوو دڵی ی بێجێ تەنزاومانت سپی کردەوەو لەچڵك و چەپەری پیسی ڕێچکەو بیردۆزە پەرستی شردەوەو پاك کردوە.

بەڵام ئێمەش لەکۆتاییدا داوایەکمان هەیە ئومێدەوارین لێمان وەربگری.

گوتم: فەرموون! هەر لەتوانامدا هەبێت بێ دڵیتان ناکەم و بۆتان جێبەجێ دەکەم.

گوتیان: بێگومان تۆش لەئێمە چاکتردەزانی کەلە نێو گەلەکەماندا هەزاران کەسی وا هەیە، کەوەك ئێمە دڵی لەو جۆرە گرفت و گرێ کوێرانە پڕبووەو مێشکی بەو جۆرە ئەفسانەو بیرە پووچانە ئاخنراوە، جا بۆیە بەپەسندی دەزانین کەئەم وتو وێژە بنووسرێتەوەو چاپ بکرێ بۆ ئەوەی هەر کەسێك کە بەمەرەدی ئێمە چووەو ڕەی لێ تێکچووە، وەك ئێمە گرێو گرفتەکانی دڵ و مێشکی لاچن و بگەڕێتەوە نێو بارەشی بەرنامەی خودا.

گوتم: بەچاوان، هەرچی لەتوانامدا هەبێ لەوبارەوە دەیکەم.

وەمنیش لەکۆتاییدا دەڵێم: سوپاستان دەکەم و خوا ڕێنرووونیتان بکات و لەتاوانەکانی ئێوەو منیش ببوورێو لوتف و بەزیی خۆیتان لەگەڵدا بنوێنێ، د لێتان بەلای خۆیدا بهێنێو زیاتر ڕێچکەو کوێرە ڕەی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییو خۆماڵیەکانتان لەبەرچاو ببێزرێنێ، چونکە بەمەبەستی لەهەق حاڵی بوون، لەگەڵم دانیشتن و بەوریژدانەوە گوێتان گرت و، لەئاقار وەرگرتنی ڕاستیدا ملەجێڕەو سەرەخەرییتان نەکرد.

"هەڵبەتە تا ئەنجامی قسان بەمە گەیشت، شەوگار لەمێژبوو، بەتاریکی ئەنگوستە چاوی خۆی هەموو کەلێن و کونی پڕ کردبوون و دیاربوو چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد کەچیدی شەونخوونی نەکێشین و لەبن باڵی هێدیو ئارامیدا بخەوین، ئێمەش خوا هەقە بێدڵیمان نەکردو لێی نووستین."

* * *

## ١- مەبەستمان لەزاراوەی نەتەوایەتی چیە؟!

ئێمە لەبەكارهێنانی وشەی (نەتەوایەتی)دا مەبەستمان پێ ئەو چەمك و مانایە نیە كە زاراوەی (ناسیۆنالیزم) دەیگەیەنێ.

(ناسیۆنالیزم یانی نەتەوەو نیشتیمان پەرستی)[1].

چونكە وەك پێشتر ڕامان گەیاند، ئیسلام لەگەڵ نەتەوەپەرستیو نیشتیمان كردنە بت و سەنەمدا، دانووی ناكوڵێ و پێكەوە هەڵناكەن، لەبەرئەوەی نەتەوەپەرستی یەكسەر لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا تێك دەگیرێن و پێكەوە بەرەنگار دەبن، ئاخر لەبیری نەتەوەپەرستیدا نەتەوەو نیشتیمان دەكرێنە خوا، یان لایەنی كەم دەبرێنە ڕیزی خوا، بێگومان لەئەنجامی ئەوەشدا لەحاڵەتی یەكەمدا كوفرو لە ئی دووەمدا هاوبەشی پەیدا كردن (شرك) ڕوودەدات، هەردووكیشیان گەورەترین تاوانن و هەڵوەشێنەرەوەی شایەتمانن.

---

[1] وشەی (ناسیۆنالیزم) وشەیەكی لاتینییە، چونكە (ناسیۆ)و (نیتۆس) واتە: شوێنێ تێدا لەدایك بوون، كە وشەی نەتەوەپەرستیو نیشتیمان پەرستی مانای پڕ بەپێستی ئەو وشەیەیە.

هەڵبەتە لێكۆڵەرەوان و سیاسەت مەداران پێناسەی جۆراو جۆریان بۆ وشەی ناسیۆنالیزم داناون، بۆ وێنە:

١- كارلتون هیس دەڵێ: (نەتەوە كۆمەڵێكی سەربەخۆی سیاسییە كە بیروباوەڕو كلتوورێكی هاوبەشی هەیە).

٢- بوبكی دەڵێ: (گەل كۆمەڵە خەڵكێكە كەخاك و ئاوو خوێن، یان زمان، یان كلتوورو مێژوو پێكەوە گرێیان دەدەن).

٣- هانس كوهن دەڵێ: (هەست و ئەستی قووڵی خۆشەویستی سەبارەت بە نیشتیمان و بە ئەمەكی بێ سنووری، هاوبەشی كردن لەدیاری كردنی چارەنووسیدا، بنچینەی ناسیۆنالیزمە، ناسیۆنالیزم كاتێك بەرەسەن دادەنرێ كەهیچ شتێك نەتوانێ ببێتە پەرچ لەرێی وەفاداری لەپێناوی نیشتیمان دا)!!

٤- ئینسكلۆپیدیا (دائرة المعارف)ی ئەمەریكی دەربارەی ناسیۆنالیزم دەڵێ: (لەچەمكە سەرەكییەكانی ناسیۆنالیزم بریتییە لە وەفاداریو خۆشەویستی سەبارەت بەگەل، زیاتر لەهەر شتێكی دیكە، لەدوورشەكانی دیكەی ناسیۆنالیزم (القومية) شانازی كردنە بە بەرهەمە نەتەوایەتییەكانەوە، وە بڕوابوونێكی قووڵ بە لێهاتوویی نەتەوەو تەنانەت بەرزیو گەورەیی ڕی بەسەر گەلانی دیكەدا). بڕوانە (اسلام وملیگرائی) ی دكتۆر محمد نقوی، ل٥٠-٥٢.

کەواتە: ئێمە لە بەکارهێنانی زاراوەی نەتەوایەتی‌دا، مەبەستمان پێ‌ ئەو هەست و سۆزە سادەیەیە کە هەڵقوڵاوی سەرچاوەی سرووشتی ساغی مرۆڤە، بەواتایەکی دی مەبەستمان لە نەتەوایەتی نیشتیمان دۆستی‌و گەل خۆشویستنەو هیچی دی[1].

جیاوازی نێوان سۆزو خۆشەویستی نەتەوەیی ئیسلامانەو نائیسلامانەش ئەوەیە، کە لەحاڵەتی یەکەمدا سۆزو خۆشەویستی‌یەکە لەسنوورو جوغزی غەریزەیی‌و سرووشتی‌ی خۆی ناچێتە دەر، بەلأم لەحاڵەتی دووەمدا لاقان لەبەرێ تێدەپەڕێنی‌و دەبێتە بیروبڕوا (ئیدۆلۆژی)، ئەو دەمیش لەگەڵ بیروبڕوای ئیسلامی‌دا تێك هەڵدەنگوون و، حەتمەن دەبێ یەکیان بۆ ئەوەی تر وەلا بنرێ!!

## ٢- سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوایەتی وەك بیرو باوەڕ:

سەرەتای سەرهەڵدانی نەتەوایەتی (القومیة) وەك بیروباوەڕێکی سیاسی‌و کۆمەلأیەتی دەگەڕێتەوە بۆ کاتی پاش ڕوودانی شۆڕشی فەرەنسا.

وە (جان جاك ڕۆسۆ) بەیەکەمین هەڵگری پەیامی نەتەوایەتی دادەنرێ، چونکە زۆر پێ‌داگیری لەسەر ئەوە کرد کەدەبێ چین و توێژو تیرەو هۆزەکانی گەل (شعب) یەك بگرن و پاڵ

---

[1] وەك لە ڕابردوشدا گوتمان دوپاتی دەکەینەوە، نابێ خۆشەوستی گەل و نیشتیمان لەسەر حیسابی ئیسلام بێت، واتە: نابێ گەلێکت خۆش بوێ کە لەئیسلامەتی‌دا هاوبەشیت ناکات، وەنابێ سۆزی نیشتیمان وات لێ بکات سەر بۆ ستەم و زۆرداری‌ی کوفر نەوی بکەی‌و، دڵت نەیەت لەپێناوی پاراستنی بیرو بڕوایەکەتدا بەجێ‌ی بهێڵی، نەء! بەڵکو دەبێ کە هەر زانیت ناتوانی مسوڵمانانە تێیدا بژی، هەروەك چۆن پێغەمبەرﷺ و هاوەلأنی نیشتیمانی نازیزی خۆیانیان بەجێ هێشت، تۆش بەجێ‌ی بهێڵی، بەلأم گرنگ ئەوەیە کۆچکردن و نیشتیمان بەجێ‌هێشتنەکەت هەلأتن و ڕاکردن نەبێت، بەڵکو بۆ خۆ کۆك کردن و ڕیـز پتەوکردن و دووبارە گەڕانەوەو سەرکەوتن بێت، ئینجا گومانیشی تێدا نیە کە بابای مسوڵمان هەتا چاری بکرێ پێوستە خۆی ڕابگرێ‌و بەرهەڵستی‌و بەرەنگاری بکات.

کورتەی قسان ئەوەیە کە بابای مسوڵمان دەبێ ئامادەبێ هەرچی هەیەتی‌و تەنانەت خۆشی بەقوربانی بەرنامەی خوا بکات، چ جای خاکو ئاوو نیشتیمانی، وەلە ڕاستی‌دا خاك و نیشتیمانی هەر لەبەر ئەوە خۆش دەوێت کەخوا پەرستی بکات و ئاین و بەرنامەی خوای لەسەر پیادە بکات.

ویَك بدەن، وەدەبیَ مرۆڤ زۆر بەتوندی بەنیشتیمان و خاك و ئاوی خۆیەوە بچەسپیَ، وەدەبیَ نیشتیمان ببیَتە چەق (مرکز)و سوورگە (محور)ی بیرکردنەوەو ئاوات و خولیای تاك و کۆمەڵ.

وە ڕۆسۆ خۆشەویستی گەل و نیشتیمانی گەیاندە سەر حەدی پێویستی پیرۆزی ئایینیو زۆر بەتوندی بیروباوەڕی پەیوەندی مرۆڤایەتیو ئایینی ڕەفز کرد.

وە ویَڕای سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسا زۆربەی یاساو بنچینەو تایبەتی‌یەکانی بیری نەتەوایەتی گووران و پەیدابوون، وەك ورووژاندنی هەست ونەست و سۆزی خەڵکی سەبارەت بەنیشتیمان و ئاڵای وڵات، وەقەدر گرتن و ڕیَزدانان بۆ پاڵەوانە نەتەوەیی‌یەکان، وەدانانی سرووده نەتەوەیی‌یەکان، وەپیَداگیری کردن لەسەر پیرۆزی‌ی زمان و ڕەگەزی فەرەنسی، وە داهیَنانی ئاهەنگ و جیَژنە نەتەوەیی‌یەکان لەسەر ڕچەی جیَژنە ئایینی‌یەکان، وەشانازی کردن بەمیَژووی فەرەنساوە، وەبڕوا بوون بەپەیامی مەزنی گەلی فەرەنسی، هەموو ئەم پایەو بنچینە سەرەکیو گچکە نەتەوایی‌یانە یەك لەودای یەك لەگەرمەی شۆڕشی فەرەنسی‌دا پەیدا بوون.

وە لەئەنجامی پەرەسەندنی دەسەڵاتی فەرەنسی لەڕۆژئاوادا، بیری نەتەوایەتی زۆر بەخیَرایی وەك ئاگری نیَو پووشیَ بڵاوبۆوە... وە بەهۆی دەرکەوتنی (ناپلیۆن)ەوە شەپۆلی نەتەوایەتی هیَندەی دیکە پەرەی سەند... لەئاکامی ئەمەشدا گەلانی دیکەش دەماری نەتەوایەتی‌یان بزووت و لەهەرکام لە ئەڵمانیاو ئیتاڵیاشدا هەست و نەست و بیری نەتەوایەتی سەری هەڵداو هاتە مەیدانی سیاسەت و ژیانی خەڵکەوە.

بەڵیَ! سەدەی نۆزدەهەم بەچاخی زیَڕینی نەتەوایەتی (عصر القومية الذهبي) ناونراوە، چونکە لەو سەدەیەدا هەرکام لە (جیفرسون)و (پین) بنچینەکانی نەتەوایەتی ئەمریکی‌یان دامەزراند، وە (جریمی بنتام)ی قەشە لە بەریتانیادا چەند داڵانیَکی دیکەی لەبیری نەتەوایەتی‌دا پەیدا کردن، وەبەپەیدا بوونی (ولیام گلادستۆن) بیری نەتەوایەتی گەیشتە لوتکەی هەرە بەرزیو، وەك بیروباوەڕیَك و ڕاپەڕینیَکی فیکری سەرلەبەری ئەوروپای مەرکەزیو ڕۆژئاوای گرتەوە.

وە هەرکام لە (گاریباڵد) و (مازینی) ئیتاڵیو (فیکتۆر هۆگۆ)ی فەرەنسیو (بسمارك)ی ئەڵمانی بەڕابەرو بنیات نەری بیری نەتەوایەتی دادەنریَن.

## ٣- بیری نەتەوایەتی بەرهەمی بێ بیروباوەڕی بوو لە ڕۆژئاوادا:

گومانی تێدا نیە کە ئینسان ناتوانێ بەبێ بیروباوەڕ بژی، جا خەڵکی ڕۆژئاواش ئایینی فەلەیی (الدین المسیحی)یان بە بیروباوەڕی خۆیان دەزانی، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئایینی گۆڕین بەدەستی قەشەو پاپاکان و دەسەڵاتدارەکان زۆر دەستکاری کرابوو و گۆڕا بوو، پاش ڕاپەڕینی زانیاری (ڕێنسانس)و ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە بەدوی‌دا هاتن، کڵێساو پەیڕەوانی چەند زەبرێکی زۆر گرچووبڕی وێ کەوتن و، ئیدی لەو ڕۆژەوە ئایینی فەلەیی لە ئەوروپادا وەك بیروباوەڕێکی زیندوو لەنێوچوو.

ئینجا لەدوایی‌دا ڕۆژئاوایی‌یەکان پتر ئایینی ناوبراویان لە مەیدانی ژیانی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی دوور خستەوە، لەئەنجامی ئەمەشدا ئینسانی ئەوروپی بۆشایی‌یەکی زل لە دڵ و مێشکدا درووست بوو، وەك پێشتر گوتمان ئینسان ناتوانێ بەبێ بیروباوەڕ بژی، بۆیە بت تاش (ئازەر)ی ئەوروپی ناچاربوو کە بتی نەتەوایەتی (صنم القومیة) بۆ خەڵکەکە دابتاشی‌و وەك ئایین و خودایەکی نوێی ڕۆژئاوا ڕای بنوێنێ!

ئینجا لە سۆنگەی ئەوەوە کەبیری ناسیۆنالیزم زیاتر وەك چوارچێوەیەکی خاڵی‌و شتێکی بەتاڵ وایەو دەبێ بەغەیری خۆی پڕ بکرێتەوە، بۆیە ڕۆژئاوایی‌یەکان ناچار بوون دەست بکەن بەگەڕان و سووڕان بۆ پەیداکردنی کۆمەڵێك بیردۆزەی جۆراجۆر بۆ پڕ کردنەوەی بۆشایی بیری ناسیۆنالیزم، بەو جۆرە هەرکام لە دیموکراسی‌و سۆسیالیزم و لیبڕالیزم لەلایەك و داریۆنیزم و فرۆیدیزم و مارکسیزم لەلایەکی دیکەوە ڕەواجیان پێدراو هەریەکەیان سووچێکی ڕێچکەی ناوبراویان پێ پڕ کرایەوە.

هەڵبەتە ئەلێرەشدا سادەیی‌و نەفامی‌ی ئەو جۆرە خۆ بەڕۆشنبیرزانانەمان بۆ دەردەکەوێ کە بەحوکمی لاساکردنەوەی کوێرانە ویستوویانەو دەیانەوێ ئوممەتی ئیسلامیش بەرەو زەڵکاوی بیری نەتەوایەتی پەلکێش بکەن، بێ‌خەبەر لەوەی کە هەموو سمێڵ سوور هەمزاغا نین و ئیسلام و فەلایەتی یەك نین و، قیاسی کەشکێش لەمەشکێ کردن کاری عاقڵان نیە.

چونکە ئیسلام بەرنامەیەکی تێرو تەواوو هەمەلایەنەی ژیانەو حەوجێی پینەو پەڕۆیان نیەو، وزەو تینێکی ئەوتۆی هەیە کەهەر پاش سەدەیەك لەسەرهەڵدانی توانی لە سەرووی ئەفریقاوە هەتا ئەوپەڕی ئاسیاو، لەئیسپانیاوە هەتا مەغۆلتستان دابگرێ‌و، هەموو ئەو پارچە

زەوییانە بکاتە یەك و، لەسەرجەمی ئەو هەموو گەل و ڕەنگ و زمانانە یەك ئوممەتی مەزنی خاوەن شارستانەتی پێك بهێنێ.

دیارە ئێستاش ئیسلام دەتوانێ کە ئەوەی بۆ کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی لەڕابردوودا ئەنجامی‌دا، ئەمڕۆش ئەنجامی بدات، چونکە هەرچەندە ڕواڵەت و دیکۆری ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگاکان گۆڕاوە، بەڵام جەوهەرو ماهیەتی ئینسان و کێشەو دەردەکانی نەگۆڕاون و هەروەك خۆیانن، بەڵام بێگومان مەکانیزیم (الیة)ی چارەسەری کێشەو گیرو گرفتەکان لەڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێك جیاوازە.

## ٤- پەیوەندی بیری نەتەوایەتی بە ئیمپریالیست و سەرمایەدارەکانەوە:

ئیمپریالیزمی جیهانخۆرو سەرمایەدار (کاپیتالیزم)ی بەزەبرو زۆر ڕۆڵێکی زۆر گرینگیان گێڕاوە لەپەرەپێدانی بیری نەتەوایەتی‌دا، چونکە لەسەدەی نۆزدەیەمدا پێشبڕکەیەکی سەیرو بێ‌ڕەزا لەنێو ڕۆژئاواییەکاندا پەیدا بوو بۆ فراوانکردنی موستەعمەرەکانیان و شەپ و گوپ لێدانی خێرو خێراتی وڵاتانی جیهانی سێیەم، بەوشێوەیە وڵاتەکانی ئاسیاو ئەفەریقیایان داگیرکرد تاکو دانیشتووانیان بچەوسێننەوەو بیان دۆشن.

جا ئیمپریالیزم و کاپیتالیزمی ڕۆژئاوا چاکترین دەستەواژە (وسیلة)ی کاریگەریان بۆ وەدەست هێنانی ئامانج و مەبەستە شووم و گڵاوەکانیان بریتی بوو لەبیری نەتەوایەتی، چونکە:

**یەکەم:**

وەك لەپێشەوە باسمان کرد پاش ڕاپەڕینی زانیاری ڕێو ڕەسمی کلێسا جێی پێ لەق بوو، لەئەنجامی ئەمەشدا ئەوڕووپا دووچاری دەردی بیربەتاڵی (الفراغ الفکري) بوو، دواییش هەم لەبەر ئەوەی کەخەڵك بێ‌بیروبارەڕی مەدار ناکات و، هەم بۆئەوەی هاندەرو پاڵنەرێك سازبکات بۆداگیرکردنی وڵاتان و زەوت کردنی خێرو بێریان ناچار بوو بکەوێتە گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوەی شتێك کە ئەومەدارەی پێ ساز بکاو ئەو بۆشاییەی پێ پڕبکاتەوە، تا سەرەنجام لەبیری نەتەوایەتی بت و سەنەمێکی درووست کردو کردیە پەیژەو دەستەواژەی وەدست هێنانی ئەو نیازو مەبەستانە.

**دووەم:**

بیری نەتەوایەتی چاکترین و کایگەرترین دینەمۆو پاڵنەری ئیمپریالیزم و کاپیتالیزمە، چونکە هەرکام لە هەست کردن بە بەرزی توخم و ڕەگەزو شانازیکردن بەمێژوو و شارستانەتی یەوەو بەرژەوەندی یەکانی نیشتیمان (المصالح الوطنیة)و بەرەو پێش بردنی گەل، دەبنە هۆی ورە وەبەرنان و تیژکردن و هاندان و هێرش بردن و داگیرکردن و... هتد.

هەڵبەتە وردە وردە بتی نەتەوایەتی گەورەتر بوو و پتر لاقی لەبەرێ تێپەڕاندن، هەتا وای لێ هات بیردۆزەی دارونی فراوان کردو لەبواری کۆمەڵایەتی و سیاسی دا بەکاری هێنا، بۆ وێنە:

(ئارنست هیگل) لەو بارەوە گوتوویەتی:

(بەس گەلە بەهێزو دەستەڵاتدارەکان مافی ژیانیان هەیەو، دەبێ گەلە بێهێزو دواکەوتووەکان بفەوتێن و نەمێنن)!!

**سێیەم:**

دیسان سەرمایەدارە زلەکان و خاوەن کارگەکان بۆ پاراستنی بازاڕی نێوخۆ تاکو بەرهەمە پیشەسازی یە خۆماڵی یەکان ساغ بکاتەوە، زۆر سوودیان لەبیری نەتەوایەتی وەرگرت، چونکە لەو ڕێیەوە هەست و نەستی خەڵکەکەیان دەبزواند کە هەرشتی خۆماڵی بکڕن و بەچاوی سووک تەماشای شتی بێگانە بکەن ئەگەر چاکتریش بێ.

دیسان لەلایەکی دیکەشەوە بەناوی بەرژەوەندی گەل و نیشتیمانەوە کەوتنە ورووژاندنی هەست و نەستی نەتەوایەتی ی خەڵك و بزواندنی دەماری خۆپەرستی یان بۆ پەیداکرنی چەند بازاڕێکی دیکەی نوێو دۆزینەوەی چەند موستەعمەرەیەکی دیکە...

هەر بۆیەش دەبینین یەکسەر پاش سەرهەڵدانی سەرمایەداری لەسەدەی نۆزدەیەمدا، بیری نەتەوایەتی گەیشتە لوتکەی هەرە بەرزی خۆی.

**چوارەم:**

هەروەها سەرمایەدارو خاوەن کارگەکان لەلایەکی دیکەشەوە سوودیان لەبیری نەتەوایەتی وەرگرت، ئەویش ئەوە بوو کەبەهۆی وروووژاندنی هەست و نەستی نەتەوەیی و نیشتیمان پەروەری یەوە کارێکی وایان کرد کەخەڵکەکە بەدەوڵەمەندو هەژارو چەوساوەو چەوسێنەرەوە پاڵ لێك بدەن و لەبەرانبەر بێگانەدا بوەستن، دیارە ئەمەش ڕێگای لەوە گرت کە هەژارو نەدارو چەوساوەکان بیرێك لەحاڵ و وەزعی پەرێشانی خۆیان بکەنەوەو، نارەزایی یەك بەرانبەر بە

سەرمایەدارە دنیاخۆرەکان دەربپن، واتە وایان لە چەوساوەو بەش خوراوەکان کرد کە لەبەر هەست و نەستی نەتەوایەتی‌و بەرژەوەندی نیشتیمانی ئاگایان لە ستەمی کۆمەڵایەتی‌ی نێوخۆ نەمێنێ‌و نەیان پرژێتە سەر خۆیان.

## ٥- بیری نەتەوایەتی لەسەدەی بیست دا:

دەگونجێ حاڵ و بەسەرهاتی بیری نەتەوایەتی لەسەدەی بیستەم دا دابەش بکەین بۆ دوو قۆناغان:

### قۆناغی یەکەم: لەنیوەی یەکەم دا

بیری نەتەوایەتی لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم داو هەتا کۆتایی جەنگی جیهانی‌ی دووەم زۆر بەزەقی لەئەورووپاو یابان دا هاتە مەیدانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌یەوە، هەر کام لەیابان و ولاتە ئەورووپی‌یەکان هیوادار کرد کە خەیاڵ پلاوی دەست بەسەر تێکڕای دنیادا گرتن لەمێشکی خۆیاندا بچەسپێنن و، لەئەنجامی ئەو خەیاڵ پلاوەشدا بیری نەتەوایەتی جیهانی خستە تەندووری پڕ ئازارو کارەساتی دوو جەنگە جیهانی‌یەکانەوە.

بەڵێ! زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوەن کەپاڵنەری سەرەکی بۆ پەیدا بوونی جەنگی جیهانی‌ی یەکەم و دووەم بریتی بوو لە ورووژاندنی هەست و نەستە نەتەوەیی‌یەکان، ئەوانەش کە بوونە سەرقافڵەو پێشرەوی بیری نەتەوایەتی لەم قۆناغەدا هەر کام لە (مۆسۆلینی) ئیتالی‌و (هیتلەر)ی ئەڵمانی‌و (بیرۆن)ی ئەرجەنتینی‌و (فرانکۆ)ی ئیسپانی‌و (سالازار)ی پورتوگالی بوون.

### قۆناغی دووەم: لەنیوەی دووەم دا

لەنیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا میکرۆبی بیری نەتەوایەتی جیهانی سێیەمی تەنی‌یەوە، جا هەرچەندە بەرواڵەت بیری نەتەوایەتی لە لابردن و دەرکردنی داگیرکەرو ئیمپریالیزمدا خۆی دەنواند، بەڵام پاش وردبوونەوەو سەرنجدانی قووڵ دەردەکەوێ کە واقیع بەو شێوەیە نیە، چونکە ڕاپەڕینی گەلانی جیهانی سێیەم دژی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر بەهاندەری هەست و نەست و بیروباوەڕی ئیسلامی‌یەوە بوو، نەک بەپاڵنەری هەست و نەستی نەتەوایەتی‌و نیشتیمان پەروەری، بەڵام دوای ئەوەی دەستەیەک لە دەروون بەزیوانی ئەورووپاپەرست بۆیان دەرکەوت

کە تازە ناگونجێ ئەوروووپا ڕاستەوخۆ سەرۆکایەتی جیهانی ئیسلامی بکات، دەستیان کرد بە پتر لێدانی دەهۆڵ و زوڕنای بیری نەتەوایەتی، تاکو پێشینان گوتەنی (زەرەر لەنیوەی وەگەڕێ)و جڵەوی کاروباری گەلانی ئیسلامی ئەگەر نەشگونجێ ڕاستەوخۆ بەدەست (ئاغا) ئەورووپایی‌یەکانەوە بێ لایەنی کەم بەدەست (کوێخاو گزیر)ە هەڵپەرست و خۆفرۆش و وابەستەو دابەستەکانیانەوە بێو بەدەردی پێشینان دەڵێن: (پارو ئەگەر لەزاریش بکەوێتە خوار، بکەوێتە نێو کۆشێ چاکە!).

ئیستاش لەم بارودۆخەی ئەمڕۆدا دوای ئەوەی بەڕواڵەت ئیمپریالیزم و داگیرکەران دەرکراون و وڵاتە ئیسلامی‌یەکان سەربەخۆیی‌یان وەدەست هێناوە، دەبینین بیری نەتەوایەتی سەرلەنوێ هاتۆتەوە گۆڕێ، بۆ ئەوەی ببێتە خزمەتکارێکی دڵسۆزو جگەرگۆشەیەکی بەوەفای ئیمپریالیزم.

چونکە لەم سەردەمەدا ئیمپریالیزمی جیهانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا بەوپەڕی توانای هەوڵی ئەوە دەدات کە گەلانی ئیسلامی هەروا بەپەرتەوازەیی‌و جیاجیایی بمێننەوەو یەکگرتنیان لەنێودا پەیدا نەبێ، جا دیارە کاریگەرترین چەکی (پەرتکەو زاڵبە)و باشترین زەوی بۆ تێدا چاندنی تۆوی دووبەرەکی، بریتی‌یە لە بیری ژەهراوی نەتەوەپەرستی‌و خاك و ئاو پەرستی‌و، خۆ کورت هەڵهێنانی هەرکام لە گەلانی ئیسلامی لە جوغزی تەسکی نیشتیمان و ڕەنگ و زمانی تایبەتی خۆیانداو، گوێ نەدان بەو جوغزو زەمینە فراوانەی کە دەتوانێ تێکڕای مرۆڤایەتی – نەك هەر گەلانی جیهانی ئیسلامی– کۆبکاتەوە، کە بریتی‌یە لە: (برایەتی ئیسلامی).

## ٦- مێژووی پەیدابوونی بیری نەتەوایەتی لە جیهانی ئیسلام دا :

وەك لەباسەکانی ڕابردوودا گوترا هەست و نەست و سۆزی نەتەوایەتی وەك غەریزەیەکی سادەو خوارسك هەر لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤەوە هەبووە، کەواتە گەلانی نێو جیهانی ئیسلامیش وەك باقی گەلانی جیهان هەست و نەستی نەتەوایەتی‌و نیشتیمان پەروەری‌یان هەر هەبووەو، ئەو هەست و نەستە سادەو سرووشتی‌یەش نەك هەر هیچ دژایەتی‌و ناکۆکی‌یەکی لەگەڵ ئیسلامدا نەبووەو نیە، بگرە ئیسلام فەرمایشتی پێدەکات و بەپەسندیشی دەزانێ.

بەڵام ئەوەی کە لەگەڵ ئیسلامدا دانووی ناکوڵێ و تێك دەگیرێن و لەمێژیش نیە لەنێو گەلانی ئوممەتی ئیسلامی‌دا پەیدا بووە بریتی‌یە لەبیری نەتەوایەتی (الفكر القومي).

جا ئێمە لەم کورتە باسە دەمانەوێ ئاوڕێك لەمێژووی سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتی بدەینەوە لەجیهانی ئیسلامی‌دا.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا بانگەوازی‌یەکانی (جمال الدین)ی ئەفغانی‌و سوڵتان (عبدالحمید)و غەیری وانیش بەرز بوونەوەو بەنێو جیهانی ئیسلامی‌دا بڵاوبوونەوە، کە بانگی جیهانی ئیسلامی‌یان دەکرد لە عارەب و کوردو تورك و فارس و گەلانی تریش کە یەك بگرن و پتر ڕیزی برایەتی‌یان پتەو بکەن و شۆڕشی خۆیان دژی ئیمپریالیزم جۆش بدەن.

هەڵبەتە مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامیش پێشتر لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانی‌دا – هەرچەندە ناتەواویشی زۆر بوون– توانیبوویان لێشاوی داگیرکەرانەو تەماع کارانەی ڕۆژئاوا بەرپەرچ بدەنەوە.

جا کاتێك هێزە زلەکان هەستیان بە مەترسی ئەو هێزو پێزەی جیهانی ئیسلامی کرد، کە لە یەکگرتن و برایەتی‌یاندا خۆی دەنوێنێ، دەستیان کرد بە سازکردنی فێڵ و پیلان و تەڵەکەیەکی نوێ، کە لەزاراوەی سیاسی‌دا جەنگی دەروونی (الحرب النفسية)ی پێ دەڵێن، چونکە ئیمپریالیزم بە تەجروبەی مێژوویی خۆی بۆی دەرکەوتبوو کە لەڕێی جەنگی چەکدارانەوە مەحاڵە بتوانێ وا بەئاسانی دەست بەسەر وڵاتانی ئیسلامی‌دا بگرێ، بۆیە وای بەچاك زانی لەپێشەوە بۆ ڕێ خۆشکردن (تمهيد)و کار ئاسان کردن، گەراو توخمی چەند بیروباوەڕێکی پیسی شەیتانانە بەنێو گەلانی ئیسلامی‌دا بڵاو بکاتەوە، چونکە ئەو ڕۆژە باش دەیزانی کە ئەوەی لەڕێی وی‌دا بۆتە کۆسپ و لەمپەرێکی قایم و مەحکەم و ناپەڵێ پێ بنێتە نێو خاکی مسوڵمانانەوە، بریتی‌یە لە (ئیسلام)، کەواتە چاکترین چارەسەر ئەوەیە کە بەر لەوەی لەگەڵ مسوڵمانان لەمەیدانی جەنگێکی ئاشکرادا ڕووبەڕوو بێ، جارێ هەوڵی بێ هێز کردن و نەهێشتنی ئەو دیوارو بەربەستە مەحکەمە بدات!!

بەڵێ! جا بۆ ئەم مەبەستەش هێزە زلە جیهانخۆرەکان کەوتنە بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی چەند ڕێچکەو بیردۆزەیەکی بێ خێرو سەر لێ شێوێن، ڕاستەوخۆ لەڕێی ڕۆژهەڵاتناس و قەشەو گەڕیدە فەلەکانەوە، یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێی دروستکردنی چەند دەستێکی کرێ گرتەو چڵکاو خۆرێکی وابەستە لەنێو جەرگەی مسوڵماناندا.

پیستروو کاریگەرتر بۆ پەرتەوازەکردنی مسوڵمانان و پارچە پارچە کردنی نیشتیمانی ئیسلامیو سست کردنی پەیوەندی برایەتیی نێوان گەلانی ئیسلامی بریتی بوو لە (ناسیۆنالیزم) بیری نەتەوەپەرستی.

لەسەرەتاوە ئیمپریالیزمی فەرەنسی دەستی کرد بە پەرەپێدانی (بیری نەتەوایەتی) لەمیسردا، وەخەڵکی میسریان هاندا لەسەر جیابوونەوە لەدەوڵەتی عوسمانیی، لەنێوان ساڵەکانی (١٨٦٣ و ١٨٧٩)ی زایینیدا فەرەنسیو ئەمەریکیو ئیتالیو ئەڵمانییەکان (٧٧) قوتابخانەی سەربەخۆیان لەمیسردا کردەوە، وەچالاکی قەشەکان گەیشتە پلەیەکی یەکجار بەرز.

ئنجا لەئەنجامی ئەمەشدا چەنگێك ڕۆشنبیری ئەورووپا مەزەب پەیدا بوو کە ئاڵای سەربەخۆیی میسرو شوێنکەوتوویی (تبعية)ی میسر بۆ ڕۆژئاوایان بەرز کردەوە، کە (رفاعة طهطاوي) بە سەرقافڵەیان دادەنرێو (طه حسين)یش بە بەرنامەرێژیان.

نابێ لەوەش بێ ئاگا بین کە میسر لەو کاتەدا وەك مێشك وابوو بۆ جەستەی جیهانی ئیسلامی، ئینجا پاش میسرو بگرە هاوکات لەگەڵ پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتیو (عارەبایەتی) لە میسردا وەك ڕۆژهەڵاتناسی ناودار (برناد لويس) دانی پێدا دێنێ سێ (٣) کەس لە جوولەکەکانی ئەورووپاش دەستیان کرد بە جووڵاندن و ورووژاندنی هەستی نەتەوەپەرستیو تورکایەتی لەنێو تورکەکان دا.

یەکەمی ئەو سێیانەش (لوملی داڤید)ە کە جوولەکەیەکی ئینگلیزی بوو و بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی بیری تەنەوایەتی سەفەری کرد بۆ تورکیاو کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی (دراسات تمهيدية) کە تەرخانی کردبوو بۆ سەلماندنی سەربەخۆیی ڕەگەزی تورك و چاکتر بوونی لە عارەب و گەلەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات.

دووەمینی ئەو سێ کەسەناش (داڤید لیۆن کۆهین)ە، کەجوولەکەیەکی فەرەنسی بوو و دەورێکی گرنگی گێڕا لە ورووژاندنی هەستی بیری ناسیۆنالیزم لەدەروونی تورکەکاندا.

لەساڵی (١٨٩٩)دا نووسەری ناوبراو کتێبێکی بەناوی (تعريف عام بتاريخ آسيا) بڵاوکردەوە کە لەوێدا زۆر پێداگیری لەسەر بەرزیو چاکتری ڕەگەزی تورك کردوە، زۆر بەو بەسەرهات و جەنگانەی هەڵگوتوە کە لەمێژووی پێش ئیسلامیاندا کردوویانن!!

وەکتێبی ناوبراو لەدەیەکانی سەدەی بیستدا وەرگێڕرایە سەر زمانی تورکی‌و بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو چاپ کراو پەخش کرا.

هەرکام لە پرۆفیسۆر (خدوری)و (برنارد لویس)یش بڕوایان وایە کە (کۆهین)ی جوولەکە بوو بیری نەتەوەپەرستی‌و تورکایەتی لەنێو ئەندامانی بزوتنەوەی (ترکیا الفتاة)دا بڵاوکردەوە، کە لەساڵی (١٩٠٨) لەدژی خەلافەتی ئیسلامی شۆڕشیان بەرپا کرد.

سێیەمین کەسی جوولەکەش کە گەورەترین دەوری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی لەنێو گەلی عارەب و تورك دا، ڕۆژهەڵاتناسی ناسراو (ئەرمینۆس فامبری) کوڕی (حاخام)ی جوولەکەکانی (مجر)ە، ئەم جوولەکەیەش وێڕای نووسینی چەند نووسراوی زۆر سەبارەت بەپێویستی بووژاندنەوەی نەتەوەی تورك، چەندان جۆرە پەیوەندی پتەویشی لەگەڵ کاربەدەست وسیاسی‌یە دەمڕاستەکانی تورکدا بەرپاکرد.

هەڵبەتە گەورەترین ئامانجی ئەورووپاش بەتایبەتی جوولەکەکان لەبڵاوکردنەوەی بیری تورکایەتی‌و عارەبایەتی‌دا پاش پارچە پارچە کردنی نیشتیمانی ئیسلامی‌و پەرتەوازە کردنی مسوڵمانان بریتی بوو لە ڕێخۆشکردن بۆ داگیرکردنی فەلەستین، چونکە جوولەکەکان زۆریان هەوڵدا کە بەترس و تەماع سوڵتان (عبدالحمید) ئیقناع بکەن، کەخاکی فەلەستینیان بداتێ بۆ جوولەکە کۆچ کەرەکان، جا پاش ئەوەی هەڵوێستی مەردانەی سوڵتان (عبدالحمید)یان دی، زانیان کە تاقە ڕێی گەیشتن بە زەوت کردنی خاکی فەلەستین، بریتی‌یە لە لەنێوبردنی خەلافەتی ئیسلامی بەهۆی لێخستنی سوڵتان (عبدالحمید)ەوە!!

زۆر بەداخەوە کە هەوڵ و پیلانەکەشیان سەری گرت و بزووتنەوەی تۆڕانی بەناوی (ترکیا الفتاة) پێك هات و، لە ساڵی (١٩٠٨)دا سوڵتان (عبدالحمید)ی لێ خست و لەکۆشکی خەلافەتێ دەری کرد!!

ئنجا دوای ئەوەی تورکەکان ئاڵای نەتەوایەتی‌یان بەرز کردەوەو درووشمی تورکایەتی‌یان هەڵگرت و کەوتنە دژایەتی کردن لەگەڵ عارەب و کوردو باقی گەلانی دیکەی پێکهێنەری ئۆممەتی ئیسلامی‌دا، ئەو گەلانەش بەتایبەتی عارەب لەبەرانبەردا کاردانەوە (رد الفعل)ی خۆیان پیشانداو کەوتنە بیری دژایەتی کردنی تورکان و داواکردنی سەربەخۆیی‌و جیابوونەوە لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی!!

بێگومان بەمەش ئیمپریالیزمی جیهانخۆر بە بەردێك سێ چوار چۆلەكەی كوشتن و ئاواتی پیسی لەمێژینەی خۆی هێنایەدی.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ كە ئەو كەسەی جوولەكەكان فوویان تێ كردو كردیانە فسۆس پاڵەوانی توركیاو توركایەتی و، ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ڕاگەیاند، بریتی بوو لە (كەمال ئەتاتورك)!!

ئینجا سێیەمین ناوچە لەدوای میسرو توركیا كە ئیمپریالیزمی ڕۆژئاواو سەهیۆنیزمی جیهانی ڕەچاویان كردبوو بۆ تێدا بڵاوكردنەوەو ڕواج پێدانی بیری نەتەوایەتی، بریتی بوو لە سوریاو لوبنان و ئەردەن، چونكە لەو سەروجەدەیدا بزووتنەوەو داموو دەزگاكانی بەمەسیحی كردن (التبشیر) لە چڵەپۆپەی چالاكییاندا بوون، مەسیحییە (كاثولیك)ییەكان لە ساڵی (١٨٣٠)دا چووبوونە شام، بەڵام پرۆتستانتەكان لە ساڵی (١٨٢٠)دا خۆیان گەیاندبۆیە!!

ناودارترین كەسیش كە دەورێكی بەرچاوو باڵای هەبوو لە پەرەپێدانی بیری نەتەوایەتیدا لەو ناوچانەدا (نجیب عازووری) بوو كە بەدامەزرێنەری بیری نەتەوایەتی عارەبی دادەنرێو كرێگرتە (عمیل)ی هەركام لە ئینگلیزو فەرەنساش بوو!

(نجیب عازووری) لەساڵی(١٩٠٤)دا كتێبێكی بەناوی (یقظة الشعب العربي) بڵاوكردەوە، ئینجا كۆمەڵێكی دامەزراند بەناوی (اتحاد الوطن العربي) وە گۆڤارێكی بەناوی كۆمەڵە (جمعیة) بڵاوكردەوە بەناوی (إستقلال العرب)!

وەیەكێك لەو مەبەستانەی گۆڤاری ناوبراو زۆر داكۆكی لەسەر كردوەو دووپاتی دەكردەوە ئەوەبوو كە (عارەب) ڕەگەزێكی سەربەخۆو جودان لەڕەگەزی تورك و، عارەب لە ڕەگەزێكی هەڵبژاردەن و لەهەموو گەلانی دیكە چاكترو پەسند ترن.

وە (عازووری) بڕوای وابوو كە بۆ ڕووخاندنی دەوڵەوەتی عوسمانی دەبێ سێ شۆڕش بكرێن؛ شۆڕشێكی عەرەبیو شۆڕشێكی كوردیو شۆڕشێكی ئەرمەنی!!

ئنجا دەبێ ئەوەش بگوترێ كە (نجیب عازووری) بەئاشكرا وەفای خۆیو وابەستەیی خۆی بەرانبەر بە ئیمپریالیزمی ئینگلیزیو فەرەنسی پێشان دەداو دەری دەبڕی كە ئامادەیە بەپشتیوانی ئینگلیزو فەرەنسا لەدژی دەوڵەتی عوسمانی شۆڕش بەرپا بكات.

جگە لە (نجیب عزووری) چەند کەسێکی دیکەش دەورێکی گرنگیان گێڕا لەرەواج پێدانی بیری نەتەوەپەرستیو عارەبایەتی لەنێو عارەبەکاندا، وەك (بطرس بستاني)و (ناصيف يازجي)و (ابراهيم يازجي)و (نوفل نوفل)و (ميخايل شحادة)و (جرجيس فياض).

بەڵام ئەوەی کە لەنێوان جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم دا گەورەترین دەوری هەبوو لەپەرەپێدان و درەوشاندنەوەی بیری ڕەگەزپەریستیو عارەبایەتیدا (ساطع الحصري) بوو، کە ماوەیەك وەزیری مەعاریف بوو لەسووریا و ماوەیەك (مدرس) بوو لە (معهد التربية العالي) لە قاهیرەو، سەردەمێکیش (مدير عام المعارف) بوو لەعێراق!!

وە شایەنی باسە کە (ساطع الحصري) ماوەی (٢٠) ساڵێك پتر لەخزمەتی ئینگلیز دابوو لەعێراق دا، لەماوەی حوکمی هەرکام لە مەلیك فەیسەڵ (١٩٢١-١٩٣٣)و مەلیك غازی (١٩٣٣-١٩٣٩)و دوو ساڵ لەسەردەمی نووری سەعیدو ئەمیر عەبدولئیلاهی وەصی!!

ئینجا ئەوەی کە هەوڵ و تەقەللاو پیلان و تەڵەکەی ئەو ڕەگەز پەرست و ناسیۆنالیستانەی درێژە پێداو، درەختی بەدو شوومی عارەبایەتی وەبەرهێناو، تاجی واقیعیەت پێ بەخشینی لەسەری نەتەوەپەرستی نا، بەرواڵەت فەلەی لەڕاستیدا جوولەکەی فرچك گرتوو بەشیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانییەوە (میشێل عەفلەق)ی گاور بوو!

ئەو میشێل عەفلەقەی کە حیزبێکی شەیتانی دامەزراند لەساڵی ١٩٤٧ ی زایینیدا بەناوی (حزب البعث العربي الاشتراكي).

ئێستاش بەپێویستی دەزانم کەلەباسێکی سەربەخۆدا ماهیەتی حیزبی بەعس بە خوێنەر بناسێنین، چونکە لەم سەردەمەدا حیزبی گۆڕین بۆتە نوێنەرو موجەسسەمەی بیری ڕەگەزپەرستیو نەتەوایەتی لەنێو عارەباکاندا[1].

---

[1] بۆ نووسینی ئەو پێنج باسانەی کە ڕابردن سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١- (كيف هدمت الخلافة؟) عبد القديم زلوم.

٢- (الحلول المستوردة) د. يوسف القرضاوي.

٣- (فكرة القومية العربية على ضوء الاسلام) صالح بن عبدالله العبود.

٤- (الإسلام والقومية) د. علي محمد نقوي.

٥- (الفكر القومي إسلامياً وتاريخياً) نجاح عطا الطائي.

٦- (اسلام و ناسيونالیزم) أبو الأعلى المودودي.

## ٧- پێناسەی حیزبی بەعسی عارەبی سۆشیالیست:

ئەم حیزبە لەسەرەتای چلەکاندا سەری هەڵداو یەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی لەساڵی (١٩٤٧)دا گیرا[1]، وەك پێشتریش گوتمان دامەزرێنەری ئەم حیزبە میشیل عەفلەقی گاورە.

جا ئەوە لەچەند خاڵێکی گوشراوو کورتدا هەوڵ دەدەین حیزبی ناوبراو پێناسە بکەین و دەمامکی سەر ڕووی لابدەین:

**یەکەم:**

حیزبی بەعس لەسەر دوو ڕەگی ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم، یان نەتەوەپەرستیو ماددەپەرستی بنایات نراوە، ئەمەش هەر لەخودی ناوونیشانەکەیدا دەردەکەوێ: (حزب البعث العربي الإشتراكي).

بەڵێ (حیزبی بەعس) ناوی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیە کە میشێل عەفلەق خڕی کردوونەوە، وە (العربي الإشتراكي) دوو وشەن نێوەڕۆك و ماهیەتی بیروباوەڕی ئەو حیزبە دەخەنەڕوو.

**دووەم:**

حیزبی بەعس دژی ئیسلامە، چونکە خودا فەرموویەتی ﴿إن الدينَ عِندَ الإسلام﴾ آل عمران (١٩)، واتە: بەرنامە لای خوا بەس ئیسلامە، وەفەرموویەتی ﴿وَمَن يَبتَغِ غَيرَ الإسلام ديناً فَلَن يُقبَلَ مِنه...﴾ آل عمران (٨٥)، واتە: وەهەرکەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ لێی وەرناگیرێ...

دیارە جگە لە ئیسلامیش کە بەرنامەی هەڵبژاردەی خودایە ﴿وَرَضيتُ لَكُمُ الإسلامَ ديناً..﴾ المائدة (٣)، هەموو بەرنامەو بیردۆزەیەکی دیکە بەهەڵەو ناهەق دادەنرێ، چونکە ﴿فماذا بَعدَ الحَق إلا الضلال..﴾ یونس (٣٢).

دەجا ئاشکراشە کە حیزبی بەعس بەڕاشکاویو بێ پەردە خۆی پاڵ داوەتە لای عارەبایەتیو سۆسیالیزم (العربي الاشتراكي)و هیچ حیسابێکی بۆ ئیسلام نەکردووە!!

**سێیەم:**

دان پێداهێنانی سەرانی حیزبی بەعس بەدژایەتییان سەبارەت بە ئیسلام:

لەڕاستیدا ئەگەر بمانەوێ هەموو ئەو پێ لێ نان و دان پێداهێنانەی سەران و دەمڕاستانی حیزبی بەعس سەبارەت بە بڕوا نەبوونیان بەئیسلام و دوژمنایەتی کردنیان دەربارەی، بخەینە

[1] بڕوانە: (عروبة الاسلام وعالميته)ی شبلي العيسمي لاپەڕە٢٣٧.

ڕوو پێویستە دەیان لاپەڕە پڕبکەینەوە، بەڵام بەدەردی پێشینان دەڵێ: (لوێچێك نموونەی تەغاریکە)، ئەوا ئێمەش چەند دەقێك بەنموونە دێنینەوە:

یەك: (میشێل عەفلەق) دەڵێ: (... إن الإستعمار والإقطاع والرجعية الدينية بمحاولتها هذه تهدف الى إجهاض جنين الثورة النامي في أحشاء شعبنا..)[1]، واتە: بێگومان ئیمپریالیزم و دەرەبەگایەتیو کۆنەپەرستی ئایینی بەم هەوڵدانەی دەیەوێ کە کۆرپەی شۆڕشی پێگەیشتوو لەنێو هەناوی گەلەکەماندا لەبار بچوێنێ..

دوو: (ناجي علوش) کە یەکێکە لەسەرانی حیزبی گۆڕین گوتویەتی: (ان البعثيين مؤمنون بفصل الدين عن الدولة، التي يجب أن تكون علمانية)[2]، واتە: بێگومان بەعسییەکان بڕوایان بەلێك پچڕاندنی ئایین و دەوڵەت هەیە، دەڵێن دەبێ دەوڵەت (عەلمانی) بێ.

سێ: (منيف الرزاز)یش کە یەکی دیکەیە لە دەمڕاستانی حیزبی بەعس گوتوویەتی: (الحركة القومية الاشتركية هي المرحلة الرابعة من مراحل تطور الحركة القومية و نضجها، فبعد أن مرت هذه الحركة بمرحلة رد الفعل الفطري ثم مرحلة الإصلاح الديني فمرحلة الوطنية البرجوازية الليبرالية كان حتماً أن تنتهي إلى مرحلة القومية الاشتراكية)[3].

چوار: (صدام حسين)یش (شەرعی خوا) بە ئیشك و قاڵب بەستوو و نەگونجاو دەزانێ و، لەوبارەوە دەڵێ: (.. الفقه الاسلامي فقهٌ رجعيٌ متحجرٌ وجامدٌ لايتوافق مع متطلبات العصر، نحن لاننسخ ولانستنسخ من الماضي، نحن لانريد من الدولة أو الحزب أن يطبق التعاليم الدينية في دائرته، لان ذلك يؤدي الى التفرقة الطائفية وبذلك نخسر شعبنا، ونريد من رجل الدين أن لايتدخل في شؤون الدولة..)[4].

بەڵێ (صدام حسين) دەڵێ شەرعی ئیسلامی هیچی بەکەڵکی ژیان نایەت و، ئەگەر وەدوای بەرنامەی خوا بکەوین خەڵکمان لەقیس دەچێ! بەڵام زانایان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە کەسێك بڵێ: (یەك یاسای) ئیسلام بەکەڵك نایەت کافر دەبێ!!

---

(1) (بيان البعث) القطر العراقي، كانون الاول،١٩٦١.

(2) (الثورة والجماهير) ناجي علوش، ل١٥٨.

(3) (فلسفة الحركة القومية العربية) منيف الرزاز، ل٩٤.

(4) (نظرة في الدين والتراث) صدام حسين.

پێنج: (الیاس فرح)یش کە یەکی دیکەیە لەزلەکانی بەعس دەڵێ: (إن نظرة حزب البعث للحياة وللدولة هي نظرة علمية ومنهجية لاتؤمن بالفكر الغيبي)[1] .

شەش: لەیەکێك لە نامیلکەکانی (میشێل عەفلەق)دا بەشێوەی پرسیار ڕوو لە (عەفلەق) کراوەو گوتراوە: (لقد اكد الرفيق القائد المؤسس في اكثر من مناسبة على الروح... رغم ان فكرنا الثوري يعتمد العلمية ورفض الجانب الغيبي..)[2] .

حەوت: لەیەکێك لەنامیلکەکانی حیزبی بەعس دا گوتروە: (لم يتناول فكر حزب البعث العربي الاشتراكي الدين من حيث هو نظرة الى ماوراء الطبيعة..)[3] .

هەشت: (شلبي العيسمي) کە یەکی دیکەیە لە ڕابەرانی حیزبی بەعسی کافر دەڵێ: (وراح رجال الدين المتعصبون يعتبرون الدين هو البديل المنشود ومادام هؤلاء يرون في الاسلام ديناً ودُنياً وفيه العلاج الشافي والكافي لكل ماتعانيه الأمة من امراض ومشكلات في شتى ميادين الحياة فقد أخذوا يبشرون الناس بإقامة الدولة على أساس الإسلام وتعاليمه؟!).

## کاکڵەی قسان:

یەك: حیزبی بەعس حیزبێکی کافرە لەسەر بنچینەی ڕەگەزپەرستیو سۆسیالیزم و ماددەپەرستی دامەزراوە.

دوو: حیزبی بەعس وەك کەلەپورێکی نەتەوەیی دەڕوانێتە ئیسلام و بڕوای بەنادیارو پەنهان (غیب) نیە.

سێ: حیزبی بەعس ئیسلامەتی بە کۆنەپەرستی لەقەڵەم دەدات و، گاڵتە بەوانە دەکات کە دەڵێن دەبێ دەوڵەت لەسەر بنچینەی ئیسلام دابمەزرێ.

چوار: حیزبی بەعس شەرعی ئیسلامی بەکۆن و ئیشك و بەکەڵك نەهاتوو لەقەڵەم دەدات.

پێنج: حیزبی بەعس دەڵێ نابێ زانای ئایینی دەست لەکاروباری دەوڵەت وەربدات.

شەش: حیزبی بەعس پێی وایە بەهۆی بەڕێوەبردنی بەرنامەی خواوە خەڵك پارچە پارچە دەبێو پەرتەوازە دەبێ.

---

[1] بڕوانە: (الفكر القومي إسلامياً وتاريخياً) ل١٧٨.

[2] (البعث والتراث) ميشيل عفلق، ل٦٠.

[3] (سلسلة الثقافة الثورية في العقيدة العربية الثورية)، ژمارە٢٠، ل٤٢.

حەوت: حیزبی بەعس وەك ماركسیزم بڕوای وایە كەدوایین قۆناغی گەشەكردن و گۆڕانی كۆمەڵ سۆسیالیزمە.

**خوێنەری بەڕێزم!**

ئەمەی ڕابرد كورتەیەكی زۆر ڕاپاژنەراو بوو لەپێناسەی حیزبی بەعسی كافر لەبەر تیشكی بیروڕاو پێلێنانی سەركردەو ڕابەرانیدا، بەڵام ئەگەر بێت و ئەو حیزبە كافرە لەبەر تیشكی پەرێزو شوێنەواری شووم و بێخێرو هەڵوێستە دڕندانەو داخ لەدڵەكانیدا پێناسە بكەین كەكارەساتی كاولكرنی كوردستان و قەتڵ عام كردنی خەڵكی مسوڵمانی كورد بەتایبەتی كارەساتی یەكجار دڕندانەو بەدناوی (بەناو ئەنفالەكان) كە نزكەی (٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار كەس لەپیرو گەنج و ژن و منداڵ زیندە بەچاڵ كران و وێرانكردنی شاری (حەما)و كوشتنی نزیكەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار كەس لەدانیشتوانیو، بۆردومان كردن و كیمایی باران كردنی شاری هەڵەبجەو كوشتنی زیاتر لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار كەس لە دانیشتوانیو، كیمایی ڕشێن كردنی دێیەكانی بادینان و ناوچەی خۆشناوەتیو... هتد وە لەسێدارەدانی چەندان زانای وەك: عبدالعزیز البدریو شێخ عارف البصریو محمد باقر الصدرو بنت الهدیو، حەپس كردن و دەركردن و لەسێدارەدان و ئەشكەنجەدانی هەزاران كەس لەژن و پیاوو پیرو گەنجی كوردو عەرەب لەعێراق و سوریاداو، شەڕ فرۆشتن بە كۆماری ئیسلامی ئێران و، داخستنی حوجرەو قوتابخانە ئیسلامییەكان و، ڕووخاندنی مزگەوتەكان و قەدەغەكردنی چاپكردن و هێنران (استراد)ی كتێبە ئیسلامییەكان و، پەرەپێدان و ڕەواج پێدانی داوێن پیسیو مەیخۆریو قومارو جاسووسیو جاشەتیو ڕێگریو دزیو كوشتارو قەدەغەكردنی بەرگ و پۆشاكی ئیسلامییانەی ئافرەتان و، سەربارەش كوشتن و بریندار كردنی هەزاران كەس لەمسوڵمانانی دانیشتووی ئێران بەهۆی بۆردومانی فڕۆكەو تۆپ و ڕۆكێت هەڵدانییەوە... چەند دیمەن و تابلۆیەكی زەقی ئەو حیزبە كافرو ڕەگەز پەرست و شۆڤێنییەن[1].

---

[1] جێی سەرسوڕمانە كە كەسانێكی خۆ بەزانا زان هەبن دوودڵ بن سەبارەت بەكافرێتی حیزبی بەعسی عەفلەقیو سەرانی وەك میشێل عەفلەق و صدام حسین و سەرانی دیكەی ئەو حیزبە كافرو دژ بەئیسلامە!!

## ١- ئیسلام تاقە ڕێی سەرفرازی و بەئامانج گەیشتنە:

لەهەموان ڕوونە کە بناغەو بنچینەی وەدەست هێنانی هەموو ئامانج و ئاواتێك و گەیشتن بەهەموو مافێك بریتی‌یە لە: (یەکگرتن و تەبایی‌و پێکەوە ڕێزبوون و برایی).

دەجا خوێنەری بەڕێز!

بەخوای بەرزو و بێ‌هاوتا ئەو یەکگرتن و ڕێزبوون و برایەتی‌و تەبا بوونە مەحاڵە بێجگە لەئیسلام بەهیچ بیروباوەڕێکی دیکە بێتە دی، وەکو لە مێژووی کۆن و نوێی خۆمان وگەلاندا دیتوومانەو ئێستاش دەیبینین!

چونکە ئیسلام بەحوکمی ئەوەی کەلەلایەن خواوە هاتووە، هیچ کەسێکی مسوڵمان و خواناس ڕۆژێك نەڕۆژان خەتەرەو خوتخوتەی ئەوەی بەدڵدا نایەت، کە دەتوانێ‌و لە بڕستی دایە بەرنامەیەکی لەئی خوا چاکتر دابنێ، کەواتە: مرۆڤەکان تێکڕا لەئاقار بەرنامەی خوادا سەر دادەنەوێنن و گەردن کەچ دەکەن.

ئینجا بەپێی پەیڕەوی خواش: یەك پەرستراو (إله)و یەك بەرنامەو یەك پێشەواو یەك کتێب و یەك ڕووگەو یەك مەبەست بۆ مرۆڤەکان دیاری کراوە، پەرستراو بەس خوا (الله)یەو، بەرنامەو پەیڕەو تەنیا ئیسلامەو، ڕابەرو پێشەوا هەر پێغەمبەرە ﷺ، بەس قورئان کتێبی بڕوا پێکراوەو[1]، تاقە ڕووگە کابەی پیرۆزەو، بەرزترین مەبەست خوا ڕازی کردنە.

جا لە بن سێبەری بەنامەیەکی ئەوتۆدا گەل پێکەوە دەبێتە براو شان لێك دەداو پشت وێك دەدا، لەئەنجامی ئەوەشدا هەم خوا لەخۆیان ڕازی دەکەن، هەم دەتوانن گشت مافێکیان دابین بکەن و پشتی هەموو دوژمنێك لەزەوی بدەن.

کەواتە: باهەموو ئەوانەی بەتەمای هێنانەدی یەکگرتن و تەبایی‌و برایین و پەنایان بردۆتە بەر چەند بیرو بیردۆزەو ڕێچکەیەك کەمایەی هەراو ئاشووب و گەل پەرتەوازەکردن و خەڵك بەرەو یەکدی کوشتن و تیرەگەری بردنن، چی‌دی بە خرت و خۆڕایی خۆیان ماندوو نەکەن و خۆشیان و خەڵکێکی زۆری دڵ ساف و سادەو خۆش بڕواش فریو نەدەن، با واز لەو کوێرە ڕێ

---

(١) هەڵبەتە (سنة)یش کە گوتارو کردارو بڕیار لەسەردان (القول والعمل والتقرير)ی پێغەمبەرمان دەگرێتەوە بریتی‌یە لە تەفسیرو لێکدانەوەی قورئان، وەك خوا فەرمویەتی ﴿وانزلنا إليك الذكر لتبين للناس مانزل إليهم..﴾ النحل (٤٤).

چەوت و هەڵانە بێنن کە لەپێش وانیش زۆران کوتایاننەوە بەڵام لەئەنجامی ماندوو بوون و گەڕان وسووڕانیکی زۆردا دەستیان لەبنی هەمبانەوە دەرچوو و تاقە دیاری‌یەك كە لەكاتی گەڕانەوەدا لەگەڵ خۆیان هێنایانەوە بریتی بوو لە (هەناسە سواری)و (پەنجەی پەشیمانی گەزین)و (دەست لەخۆ شۆردن)!!

بەڵێ! باواز لەو ڕێچکەو بیردۆزە بێ خێرانە بهێنن کە تەنانەت لەنیشتیمانی لەدایك بوونیشیان دا هیچیان بۆ کۆمەڵ نەکردوەو هەر زیاتر خەڵکیان پێك وەرکردوە.

ئنجا شتێکی ڕوونە کە ئیسلام بەچەند قۆناغی تاقی‌کرنەوەدا تێپەڕیوەو لەگەڵ هاتۆتە دەرێ، بەڵام ئەو بیردۆزە دەست کردانە لەژێر تین و فشاری چەکوچی واقیعی ژینی مرۆڤدا بوونە تۆزو گەردو بە هەوا داچوون و، لە نێو کوورەی گەرمی تاقیکردنەوەی مێژوودا بوونە گازو دوکەڵ و بێ سەرو شوێن بوون[1].

ئەو ڕژێم و دەوڵەتانەش کە دەبینین بەڕواڵەت لەسەر بنچینەی ئەو بیردۆزانە بنیات نراون، ئەگەر ڕاستیت دەوێ هەر کام لەو ڕژێم و دەوڵەتانە پەیکەرێکی بێ کاکڵ ونێوەو بە حوکمی ئاگرو ئاسن ڕاگیراوەو بەعاستەم توێژاڵی تەنکی دەرەوەی بۆیەیەکی کەم تەمەنی یەکێك لەو بیردۆزانەی لێدراوە، دەنا بەدەردی کورد دەڵێن کەر لەکوێ کەوتوەو کوندە لەکوێ دڕاوە[2]!

ئینجا ڕەنگە یەکێك لێردا بپرسێ:

باشە ئەگەر ڕاستە ئیسلام تاقەڕێی سەرفرازی‌و بەمراد گەیشتنە، ئەدی بۆچی دەبینین وڵاتە نائیسلامی‌یەکان لەوپەڕی پلەی پێشکەوتن و شارستانی‌یەتی دان و، بەپێچەوانەوەش وڵاتە ئیسلامی‌یەکان یەکجار پاشکەوتوو و بەجێ‌ماوو بێ سەرەو بەرەن؟!

لەوەلامدا دەڵێین:

دەربارەی پێشکەوتنی وڵاتە نائیسلامی‌یەکان خستنەڕووی چەند شتێك پێویستە:

---

[1] سپات بوونەوەو لەبرەو کەوتن و بازاڕ شکانی بیردۆزەو ڕێچکە مرۆڤ کردارەکان لەم سەردەمەدا لەهەموو کاتێك چاکتر دەبینرێ‌و بۆتە دیاردەیەکی هەرە زەق و بەرچاوی ئەم ڕۆژگارە.

[2] بۆ ئیسپاتی ئەم ڕاستی‌یە سەرنجی کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) بدە، تەفسیری ئایەتی شەشەم.

١- پێشکەوتن لە بورای پیشەسازیو تەکنەلۆژیاو لایەنی ماددیدا چەند هۆو بنەمایەکی تایبەتی هەن وەهیچ پەیوەندی بەڕاستیو ناڕاستی بیروباوەڕەوە نیە، (یابان)یش چاکترین نموونەیە لەو بارەوە[1].

٢- پێشکەوتن و شارستانیەتی بەس بریتی نیە لەدروست کردن و داهێنانی ئامێرو کەل و پەل و بنیات نانی خانوو و بەرەو چوونە سەرمانگ و بن زەوی کۆڵین و نێو دەریا پشکنین!

٣- وڵاتە نائیسلامیەکان ئێستا لەوپەڕی ژینتاڵیو چارەڕەشیو دڵە ڕاوکەو نائارامیدا دەژین و، وێڕای ئەمەش هەراو ئاژاوەو جەنگ و وێرانکاری هەموو دنیاش ئاگرێکەو لەپێشی ئەوان هەڵدەستی، زاناو بلیمەتە بەویژدانەکانیشیان بەڕاشکاوی دانیان بەم ڕاستیە تاڵانەدا هێناوە[2].

٤- بەپێی لێنانی مێژووزانەکان هەموو ئەو زانیاریانەی کە بوونە بنچینەو سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئەم بەرەو پێش چوون و گەشەکردنە ماددیەی ئێستای جیهانی نائیسلامی بەرۆژهەلأت و ڕۆژئاوایەوە، کاتی خۆی ئەورووپاییەکان لەڕێی وڵاتی ئەندەلوس (ئیسپانیا)و دوورگەی قوبرس و جەنگی خاچ پەرستانەیانەوە لەجیهانی ئیسلامیانەوە وەرگرت و پاشان بۆ خۆیان زیاتر گەشەیان پێ کردو خەملأندیان!

کەواتە بەدەردی پێشینانمان دەڵێن: ئەم پێشکەوتنە ماددیە بەناو شارستانەتیەش (هەر ڕۆنی خۆمانە لەسەرمانی دەدەنەوە)!!

وە دەربارەی پاشکەوتوویەتیو بەجێماوی جیهانی مسوڵمان نشینی بەناو (ئیسلامی)یش دەبێ لەم ڕاستیانە بێئاگا نەبین:

١- ئەگەر مەبەست لە (وڵاتە ئیسلامیەکان) ئەو وڵاتانە بن کە مسوڵمان نشینن و خەڵکێکی لەسەر ئیسلام حیساب کراویان تێدایە، ئەوە تەعبیرەکە ڕاست و بەجێیە، بەڵام ئەگەر مەبەست وڵاتانێك بن کەبەرنامەی ئیسلامیان تێدا بەڕێوە دەبردرێ، ئەوە پێویستە تەعبیرەکە بگۆڕدرێ،

---

(١) یابانیەکان کەگەلێکی بت و سەنەم پەرستن، لەبواری تەکنەلۆژیاو پێشکەوتنی ماددیدا ئەورووپاو ئەمەریکاشیان بۆرداوەو بەجێ هێشتوون.

(٢) بۆ ئیسپاتی ئەم ڕاستیە سەرنجی کتێبی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) بدە، تەفسیری ئایەتی شەشەم.

چونکە تائێستا یەك تاقە وڵاتی (ئیسلامی) ڕاستەقینەی ئەوتۆمان نیەو[1] ، لاف لێدانی ڕووت و بێ کردەوەو بەرهەم و پەرێزیش هیچی پێ ئیسپات ناکرێ!

٢- خوای کاربەجێ دوو کۆمەڵە یاساو دەستووری بۆ دانـاوین، کۆمـەڵێکیان لەشێوەی بەرنامـەو ئـاییندا ڕەوانـە کـراون و، کۆمەڵەکـەی دیکەشیان لـەنێو بوونـەوەرو دیـاردە سرووشتیەکاندا ڕۆنراون، هەڵبەتە بۆ درووست بوونی ژیانێکی مرۆڤانەی ڕاست و بنیات نانی شارستانەتی (مدنیة)یەکی تەواو ڕەچاوکردن و کارپێکردنی هەردووك کۆمەڵە یاساو دەستوور شتێکی پێویستەو، شتاقیان بەبێ ئەوەی دیکە بەرهەمی پێویست و چاوەڕوان کراویان نابێ، بەڵکو بەدەردی زانایەکی ئەورووپی گوتوویەتی: (ئایین بەبێ زانیاری وەك بابای شەل وایە، زانیاریش بەبێ ئایین وەك بابای کوێر وایە)[2] !!

جا لەڕاستی‌دا ئێستا مسوڵمانان لەبەر بێ ئاگایی لەیاساو دەستوورەکانی سروشت و نەبوونی زانیاری، وەك مرۆڤی شەل و سەقەت ناتوانن بەشێوەیەکی ڕێك پێك و هاوسەنگ (متوازن) لەسەر لاقی خۆیان بوەستن حەوجێی دەستی ئەملاو ئەولان و، ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەکانیش لەسۆنگەی نەبوونی ئایینێکی ڕاست و درووستەوە وەك بابای کوێر ڕەفتار دەکەن و، هەر بەو چەك و تەکنەلۆجیایەی کەبەرهەمی زانیاریەکەیانە بەروبوونەتە گیانی یەکدیو خەریکن خۆیان و خەڵکش لەبەین دەبەن!!

٣- نابێ لەوەش بێ هەواڵ بین کە مسوڵمانان سەردەمێك کە بەڕاستی (ئیسلامی) بوون و خاوەنی دەوڵەتی ئیسلامی بوون، لەهەموو بوارە ماددیو مەعنەویەکانی ژیاندا سەرقافڵەو مامۆستاو چاوساغی جیهان بوون.

---

[1] دیارە ئێران و سوودان و شیشان و شوێنی دیکەش هەن کە -الحمدلله- کیان و قەوارەی سیاسی‌یان بەناوی ئیسلامەوە تێدا درووست بووە، بەڵام حوکمڕانانی ئەوشوێنانە خۆشیان پێ لەو ڕاستی‌یە دەنێن کە جاری کرچ و کاڵیو کەم و کووڕیان زۆرە!

[2] دیارە جێبەجێ کردنی ڕاست و دروستی ئایین و دەستوورو یاساکانی ڕاستەوخۆ دەبێتە مایەی وەرگرتن و ڕەچاوکردنی یاسا زانستیو سرووشتیەکان وەك کاتی خۆی زاناو توێژەرە ئیسلامیەکان لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا کردیان.

## ٢- بۆچی دوایین بەرنامەی خوا لەنێو گەلی عارەبدا هاتەخوار؟!

ترسناکترین نەخۆشی کە لەئەنجامی بڵاوبوونەوەی میکرۆبی ناسیۆنالیزم بەنێو گەلانی ئیسلامداو، لەنێو گەلی کوردماندا پەرەی سەندوەو گەلێك کەسی بەسەهوو بردوەو کەواندوەو، لەئیسلامەتی تۆراندوە، بریتی‌یە لەڕەفز کردن و نەویستنی ئیسلام چونکە لەنێو گەلی عارەبدا بەزمانی عارەبی نێرراوە!!

جا سەیر لەوەدایە کە هەرکام لەو بەرەچەڵەك مسوڵمانانەی کە بە ئیسلام ڕازی نین لەبەر ئەوەی لەهەڵ و مەرجێکی وادا نێرراوە، هیچ پێی نەنگ و شوورەیی نیە، کە لەڕۆژێکی ساردی زستاندا پاڵتۆیەکی ڕووسی دەبەر بکاو، چەترێکی ئەمەریکی لەسەرخۆ هەڵبداو، گۆرێ‌یەکی ئینگلیزی دەپێ بکا!!

بەڵام کە باس دێتە سەر ئیسلام، مووی قرژ دەبن و نێوچەوانی گرژ دەبێ‌و دەڵێ:

مەگەر ئیسلام لەنێو عارەباندا و بەزمانی عارەبی نەنێرراوە؟! کەواتە هیچ پەیوەندی بەئێمەوە نیە.

ئێستا وەرن باتێکڕا بەوردی سەرنجی ئەم جۆرە هەڵوێستە بدەین بزانین، هۆو بنەمایەکەی چی‌یەو، چۆن سەری هەڵداوە؟! قسەی ناسیۆنالیستەکان کە گوایە، ئەوان بۆیە ئیسلام ڕەفز دەکەن چونکە دیاردەیەکی نەتەوەیی گەلی کورد نی‌یەو، ئەوانیش بەس بەشتی خۆماڵی‌و نەتەوەیی ڕازین[1]، ناتوانێ ئیقناعمان بکات، چونکە خۆ نەپاڵتۆ ڕوسی‌یەکەو نەچەترە ئەمریکی‌یەکەو نەگۆرێ ئینگلیزی‌یەکەش دیاردەو بەرهەمی نەتەوەیی کورد نەبوون!

بێگومان ناشلوێ بگوترێ: ئاخر کەل و پەل و بیروباوەڕ لێك جوودان، چونکە،

**یەکەم:**

ئێمە هەر بەقەستی نموونەمان بەکەل و پەل هێنایەوە دەنا ئەو جۆرە کەسانە بەرلەوەی کەل و پەل لەو نەتەوە بیانیانە وەربگرن بیروبۆچۆن و بیردۆزانیان لێ وەردەگرن، مەگەر بیردۆزەی

---

[1] لەڕاستی‌دا ئەم خەسڵەتەی نەتەوەپەرستەکان دیاردەیەکی نەفامی‌یەو لەگەڵ چەمکی مرۆڤایەتی‌دا ناگونجێ سەرەڕای دژایەتی لەگەڵ ئیسلامدا.

(مارکسیزم ـ لینینیزم) زادەی بیروهۆشی کوردەکانی سلێمانیو دیاربەکرو سابلاغە یان ئی مارکسی ئەڵمانیو لینینی ڕووسیاییە!

یان مەگەر بیردۆزەی داروینیزم مام پیرۆتی هەڵشۆیی بنیاتی ناوە یاخود داروینی ئینگلیزی.

یان ئایا بیری بوونایەتی (الوجودیة) هەڵقوڵاوی زەینی کوردێکی شاربازێڕییە یان بابایەکی ئەمریکی؟!

**دووەم:**

هەروەک چۆن سوود وەرگرتن لەگەل و پەلەکان لەسەر هیچ گەل و تیرەیەک تاپۆ نەکراوە، ئایینەکەش موڵکی تایبەتی هیچ گەل و تیرەک نیەو هەموو مرۆڤایەتی تێیدا بەشدارە بەیەکسانی، تەنانەت ئەگەر گەل و پەلەکان مۆرو ناونیشانی کارگەو وڵاتێکی دیاری کراویان پێوەیە، ئایین –مەبەست لەئایین بەس ئیسلامە[1]– ئەوەندەشی نیەو، بێجگە لەمۆری کارگەی خوایەتیو ناوونیشانی بەرنامەی ژیانی مرۆڤایەتی، هیچ شتێکی دیکەی پێوە نیە.

کەواتە: پێشگیری کردن لەوەرگرتنی ئیسلام بە بڕو بەهانەی ئاوا بێجێ، شتێکی ماقووڵ و ژیرانە نیەو لەمرۆڤی تێگەیشتوو ناوەشێتەوە.

مادام وابێ بابزانین هۆی ڕاستەقینەی پێشگیری کردن و ڕقی نەبوونی ناسیۆنالیستەکان لەئیسلام چییە؟!

بە بۆچوونی بەندە دوو شتی سەرەکی هەن کە بوونە هۆی دوورەپەرێزی ئەو جۆرە کەسانە لەبەرنامەی خوا:

**یەکەم:**

هەبوونی دەستەیەک عارەبی خوانەناسی ڕەگەز پەرست (مەبەست عارەبە بەعسیو شۆڤێنیەکانن) کە بەشێکیان هەر بێ پەردە دەری دەبڕن کە بڕوایان بە ئیسلام نیەو دەڵێن: ئیسلام بۆیە لە نێو گەلی عارەب دا سەری هەڵداوە، چونکە لەهەموو گەلانی دیکە لێهاتووترو زیرەکترن و (محمد) عارەبێکی بە مشووروو بلیمەت و لێزان بوو، بۆیەش بەناوی ئایینەوە

[1] چونکە تاقە ئایینی ڕاست و تەواوو ئیعتبار پێکراو بەس ئیسلامە.

خەڵکی بانگ کرد چونکە زانی ئەگەر بەناوی خواوە قسە بکات چاکتری لێ وەردەگرن و فەرمانبەری دەکەن!

ئێمە لێرەدا قسەمان لەگەڵ ئەوانەدا نیە، بەڵام ئەوانەی ئێمە قسەمان لەگەڵیان هەیە بەشی دووەمیانن کە دەڵێن: بەڵێ ئیسلام ئایینێکی خواییەو محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام خوای زانا بۆیە دوایین بەرنامەی خۆی لەنێو نەتەوەی عارەب دا نارد، چونکە خوا گەلی عارەبی لەنێو گشت گەلانی جیهاندا هەڵبژاردوەو ئیمتیازی داونێو ویستوویەتی لە هەموانیان بەرزتر بکاتەوەو پتر ڕێزیان لێ بگرێ!

بەکورتیو بە کوردی ئەو عارەبە ناسیۆنالیستانە دەڵێن: دیارە گەلی عارەب لەهەموو گەلانی دنیا باشترن و خوا لە هەموانی خۆشتر دەوێن، بۆیە دوایین پەیڕەوی خۆی لەنێو واندا ناردوە.

جا لە ئەنجامی ئەم جۆرە قسانەداو، لەئەنجامی زۆر شتی دیکەی نەتەوەپەرستانەو نائیسلامییانەدا -کە دەربڕینیان دەرفەتێکی گونجاوتری گەرەکە[1] ، دیسان لەکەسیش شێرراوە نین!- هەندێك لەو ڕۆڵە کوردانەی کە یان چاك لەئیسلام حاڵی نەبوون و بڕوا دامەزراو نین، یان هەر مسوڵمان نین و کەوتوونە بەر تین و تەوژمی ڕێچکە دەست کردەکان، لەبەرانبەر هەڵوێستی نەتەوەپەرستانەی ئەو پێڕە عارەبە ناسیۆنالیستەدا کاردانەوەیەکی نەتەوەپەرستانەتریان گرتۆتە بەر، بەهیچ ڕەنگێك ئامادەنین کەتەنانەت گوێبیستی باس و خواسی ئیسلامیش بن هەتا وەبڕوا پێهێنان و وەشوێن کەوتنێ ڕادەگا.

چونکە ئەو ڕۆڵە کوردە لە ئیسلام بێئاگایانە کە ئەم جۆرە قسەو هەڵوێست و ڕەفتارە نائیسلامییانەیە لەو پێڕە نەتەوەپەرستە دەبینن، دەڵێن ڕەنگە ئەو عارەبانەش کە لە سەرەتاوە قورئانیان لەنێودا هاتە خوار هیچ ڕوویان لەمانەی ئێستا وەرنەگێڕابێ! جا لەئەنجامی ئەو بەراورد کردن و قیاس و پێك گرتنەدا نەك هەر ڕق و قین لەعارەبە مسوڵمانەکانی پێشین هەڵدەگرن، بەڵکو لەئیسلامیش دەتۆرێن و زیز دەبن و بەمەرەدی ئەو کەسە دەچن کەپێشینان لەبارەیانەوە گوتوویانە: (زاری بەشیر سووتابوو فووی لە (دۆ)ش دەکرد)!

---

[1] بۆیە ئەم قسەیە کراوە چونکە ئەم کتێبە حەڤدە(١٧) ساڵ پێش ئێستاو کاتی حوکمڕانی ڕژێمی بەعس بەسەر کوردستان نووسراوە.

**دووەم:**

بەڵام وەنەبێ تاقە هۆی دوورە پەرێزی هەڵگرانی ئاڵای ناسیۆنالیزم و هەموو شتە ئیزم دارەکانی دیکەش -لەنێو گەلەکەماندا- بەس بێ ئاگایی لە ئیسلام و دیتنی هەڵوێستی نەتەوەپەرستانەو خۆسەپێنەرانەی عارەبی بەدفەڕو نامسوڵمان بێ، بەڵکو هەشیانە زۆر چاك دەزانێ کە ئیسلام هیچ پەیوەندی‌یەکی بە هیچ کام لە گەل و تیرەکانەوە نیەو ئایینێکی خودایی‌و جیهانی‌یە ، بەڵام هەر بڕوای پێ‌ی نیەو کەوتۆتە شوێن ڕێچکەو بیردۆزەیەکی دیکە، بۆیەش لەڕەفز کردنی ئیسلام دا پەنا دەباتە بەر بیری ناسیۆنالیزم تاکو بەدەردی کورد گوتەنی: بە بەردێکی دوو کێلان بشکێنێ، هەم گەلەکەی هەڵخەڵەتێنێ بەوەی کە گوایە ئەو ڕقی لە ئیسلام هەڵناستی‌و بێ بڕوا نیە، بەڵام بۆیە گوێڕایەڵی نابێ چونکە ئایینی عارەبانە، هەم بیری ناسیۆنالیزم و هەر بیردۆزەیەکی دیکەش کەبیەوێ لەجیاتی ئیسلام بخاتە بیرو مێشکی گەلەوە، بێ ئەوەی لۆمەو سەرکۆنە بکری‌و بەنامە خراپ بژمێرری!!

جا سەیر لەوەدایە کەلەنێو هەردووك بەرەی ناسیۆنالیستی عارەب و کورددا کارو کاردانەوە (فعل ورد فعل)ێکی توندو تیژ هەیە، جارێ لەلایەکەوە عارەبە ناسیۆنالیستەکان دەڵێن: ئێمە هەڵبژاردەی گەلانین و هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوەی عارەب باڵاتر نیەو، عارەب ئیمتیازیان بەسەر هەموو گەلانی جیهاندا هەیە، وەلەکاردانەوە (رد فعل)ی ئەو درۆو دەلەسە بێ بنچینانەی واندا بەرەی ناسیۆنالیستی کوردیش دەڵێن: گەلی عارەب بەدترین و دواکەوتووترین و کەودەن ترین گەلی سەر زەوین و ئیسلامەتیش چونکە بۆوان هاتوە دیارە بێ کەڵك و پووچە!!

ئەمما گومانی تێدا نیە کە شتاق لەو دوو بەرەیە هەڵوێستێکی ڕاست و واقیعی‌یان نەگرتۆتە بەر، چونکە وادیارە هەر کامێکیان، سواری ئەسپی سەرکێشی بیری گەل پەرستی بووەو، لەپرتاویان لاقی دەبەرێك ئاڵقاون و سەرچەنگ چووە.

بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کەبەشی زیاتر لە عارەبە ناسیۆنالیستەکان دەستیان لە هەڵایساندنی ئاگری ئەو هەراو ئاژاوەیەدا هەیەو گەلی کورد بەزۆری وەك کاردانەوە (رد فعل)ی عارەب و تورك و فارسە نەتەوەپەرستەکان کەوتوونەتە چاڵی نەتەوەپەرستی‌یەوە بەس بەرپەرچ دانەوەی قسەو ئیدیعای ئەوان بەپێویست دەزانم.

کەواتە بابزانین خوای کاربەجێ لەبەرچی دوایین بەرنامەی خۆی لەنێو عارەباندا نارد؟!

بەڵام پێشەکی بابزانین ئایا ڕەوایە بگوترێ گەلی عارەب یان هەر گەلێکی دیکە لەگەلانی دیکە چاکترو گەورەترە؟!

دەتوانین لەچەند خاڵێکدا ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە:

١- بەر لەهەمووشتێك پێویستە بزانین کە لەڕوانگەی ئیسلامەوە ڕەوا نیە هیچ تیرەو گەلێك خۆی بەسەر تیرەو گەلانی‌تردا بابداو شانازی‌یان بەسەردا بکات، بەڵکو لەڕاستی‌دا ئەو خۆبادان و خۆهەڵکێشانە لەقورئانی قسەلەجێ‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺدا بەتوندنی تاوانبار کراوە، وەك لەلاپەڕەکانی پێشودا ڕوون کرایەوە، بۆ وێنە خوای زانا لەبەرپەرچ دانەوەی جوولەکەکاندا کەدەیان گوت: ﴿نحن ابناء الله واحباؤه﴾ ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین، فەرمووی: ﴿قل فَلِمَ يُعذبكم بِذُنوبكم بَل انتم بَشَرٌ مِمن خَلَقَ..﴾ المائدة (١٨)، واتە: بڵێ: ئەدی -ئەگەر ڕاستە کوڕو خۆشەویستی خوان- بۆچی بەهۆی تاوانەکانتانەوە سزاتان دەدات! نەخێر بەڵکو ئێوەش مرۆڤێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردوون..

دیسان خوای کاربەجێ لەکاتێکدا فەرمانی بەشەیتان کرد کڕنووشی ڕێز گرتن بۆ ئادەم بەرێ ویڕای کۆمەڵی فریشتان، شەیتان یاخی بوو و سەرپێچی کرد، لەعنەت و نەفرینی لێ کردو لەبەزەیی خۆی دووری خستەوە، هەڵبەتە کاتێك شەیتان فەرمانی خوای جێبەجێ نەکرد، خوا لێی پرسی بۆچی‌و چ شتێك ڕێی لێ گرتی کە کڕنوش بەری! شەیتان لە وەڵامدا گوتی من لەئادەم چاکترم، ئەو لەقوڕێ دروست کراوەو من لەئاگر ﴿ولقد خلقناكم ثم صورناكم ثم قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس، لم يكن من الساجدين، قال: مامَنَعَكَ الا تَسجُد إذ امرتُك؟! قال انا خَيرٌ منه خَلَقتَني من نار وَخَلَقتَه من طين﴾ الأعراف (١١- ١٢)، واتە: وەئێمە خوڵقاندمانن دوایی وێنەتانمان کێشا، ئینجا بەفریشتانمان گوت: کڕۆنووش بۆ ئادەم بەرن جا هەموویان کڕنۆشیان برد بێجگە لەشەیتان، ئەو لە کڕنووش بەران نەبوو، -خوا- فەرمووی: چ شتێك پێشگیری لێ کردی کە کڕنووش ببەی کاتێك فەرمانم پێ کردی؟، گوتی: من لەو چاکترم، منت لەئاگر خوڵقاندوەو ئەوت لەقوڕێ خوڵقاندوە.

وەك لێرەدا دەبینین شەیتانی بەد بۆ پاکانە (تەبریر)ی هەڵوێستی یاخی بوونەی خۆی پەنا دەباتە بەر هەمان بەڵگەی جوولەکەو نەتەوەپەرستەکان!

بەڵێ! شەیتانیش وەکو وان لەجیاتی ئەوەی شانازی بەکردارو ڕەفتارێکەوە بکات کە بەئازایەتی خۆی وەدەستی هێناوە، شانازی بەماددەو توخم و ڕگەزەکەیەوە کردوە کەهیچ

دەستی وی تێدا نیە! کەواتە: هەرکەسێك بیەوێ بەهۆی شتێکەوە خۆی باداو شانازی بەسەرخەڵکدا بکات، کە بەئازایەتیو تێکۆشانی خۆی وەدەستی نەهێناوەو خوا بۆی بڕیار داوە، وەك: ڕەگەز، نەتەوە، نیشتیمان، ڕەنگ و زمان، ئەوە ڕچەی شەیتانی بەدی گرتوەو بە بەڵگەیەکی شەیتانی خۆی بەسەهوو بردوەو ڕێی ڕاستی بزرکردوە[1] !

٢- لەڕوانگەی قورئانەوە گەلی عارەب بەر لەهاتنی ئیسلام گەلێکی سادەو نەخوێندەوارو سەرگەردان بوو وەك خوای زانا فەرمویەتی ﴿هُوَ الذي بَعَثَ في الأميين رسولاً منهم... وإن كانوا من قَبلُ لَفي ضَلالٍ مُبين﴾ الجمعة (٢)، واتە: خوا ئەو کەسەیە کە لەنێو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لەخۆیان نارد... وەبێگومان ئەو گەلە بەر لەهاتنی وی لەنێو سەرگەردانی‌یەکی ئاشکرا بوون.

دیسان وەك قورئان هەواڵی پێ داوین عارەبەکان پێش هاتنی ئیسلام پێکەوە دووژمن بوون و شیریان لەیەکدی دەسوو: ﴿واذكروا نعمة الله عليكم إذ كنتم أعداءً فَألف بين قُلوبكم فأصبَحتُم بنِعمَتِه إخواناً...﴾ آل عمران (١٠٢)، واتە: وەیادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، کاتێك -بەر لەهاتنی ئیسلام- پێکەوە دوژمن بوون، بەڵام خوا دڵتانی پێکەوە بەست، ئینجا بەهۆی بەرنامەی خواوە بوونەبرا..

هەروەها وەك قورئان هەواڵی پێ داوین ئەگەر هاتباو خوای گەورە قورئانی ناردبایە سەر گەلێکی دیکەی غەیری عارەب، ئەوا عارەبەکان ئامادە نەبوون بڕوای پێ بێنن، وەك فەرموویەتی ﴿ولو نزلناهُ على بعض الأعجمين فقرأه عليكم ما كانوا به مؤمنين) الشعراء (١٩٨-١٩٩)، واتە: ئەگەر هاتباو- قورئانمان- ناردبایە سەر هەندێك لە عەجەمەکان[2] و بەسەر-عارەبەکان-ی‌دا خوێندبایەوە، بڕوایان پێ نەدەهێنا.

لەم دەقە قورئانی‌یەدا وا دەردەکەوێ کەخوای کاربەجێ بۆیە قورئانی لەنێو گەلی عارەبدا ناردۆتە خوار، چونکە گەلێکی هێندە کەللە ڕشك و خۆپەسەندو گۆشەگیر بوون، ئەگەر نێررابایە

---

[1] بێگومان ئەو شێخ و سەییدو ئاغاو میرو بەگانەش کەخۆیان بەوەجاخ و ڕەچەڵەك (نسب)ەوە هەڵدەکێشن و هەر لەبەر ئەوەی بەعورفی کۆمەڵگا ناوی شێخ و سەییدو ئاغاو میرو بەگیان بەسەردا براوە خۆیان لەخەڵکی بەزۆرتر دەگرن، وەبەر ئەو حوکمە دەکەون.

[2] (عجم) واتە: غەیری عارەب.

سەر غەیری خۆیان، بڕوایان پێ نەدەهێنا، بەڵام وادیارە عەجەم لەعارەب زەین ڕوونترو ئاسۆی بیریان فراوانترو ئامادەتر بوون بۆ وەرگرتنی حەق لەهەر کەسێکەوە بێ.

ئێستا خوێنەری ئازیز!

لەخاڵی یەکەمدا ڕوون بۆوە کە گەل و نەتەوەکان هەموو یەکسانن و هەر گەل و نەتەوەیەکیش لاف ئیمتیازو گەورەیی لێ بدات بەسەر گەلانی دیکەدا، ئەوا بەهەڵە داچووەو ڕێی ڕاستی بزر کردوەو ڕەچەی شەیتان و جوولەکانی گرتووە.

لەخاڵی دووەمیشدا خراوەتە ڕوو کەقورئان فەرموویەتی: گەلی عارەب بەر لە هاتنی ئیسلام، سادەو نەخوێندەوارو سەرگەردان بوو ون[1] ، وەپێکەوە ناکۆك و ناتەباو دوژمن بوو ون، دیسان ڕاگەیەندراوە کەئەگەر قورئان نێررابایە سەر گەلێکی دیکەی غەیری عارەب، ئەوا گەلی عارەب ئامادە نەبوون بڕوای پێ بێنن و بەدوای بکەون.

کەواتە: لێرەدا دەردەکەوێ کەهاتنی ئیسلام لەنێو گەلی عارەب دا ناگونجێ بکرێتە بەڵگەی لێهاتوویی‌و گەورەیی عارەب بەسەر گەلانی دیکەدا، چونکە دیتمان قورئان کەباسی نەتەوەی عارەب دەکات پێش هاتنی ئیسلام، لایەنی کەم ئەگەر شکاندن و تانە لێدانی لێ نەفامرێتەوە، مەدح و پێ هەڵگوتنیش ناگەیەنێ.

جا ئێستا کە بەکورتی زانیمان دەعوای ئیمتیازو زیادی‌ی عارەب بەسەر گەلانی دیکەدا چەند بێ بنچینەیەو، زانیمان کە هەڵبژێررانی عارەب بۆ تێیدا ڕەوانە کرانی دواین پێغەمبەرﷺ لەبەر چاوی کاڵی عارەب و لەبەر گەورەیی‌و ئیمتیازو زیدەیی‌یان نەبووە، بابزانین هۆو حیکمەتی ئەو دیاردەیە چی‌یە؟!

## حیکمەتی هەڵبژێررانی دوایین پێغەمبەر لەنێو گەلی عارەب دا

### یەکەم:

پێش هاتنی ئیسلام دوو دەوڵەتی زەبەلاح حوکمڕانی‌ی جیهانیان لەدەست دابوو، جیهانیان دابەش کردبوو، کەبریتی بوون لە فارس و ڕۆم، لەدوای وانیشەوە هیندو یۆنان بوون.

---

[1] لەئاڵقەی سی‌یەمی (ئیسلام و ڕێچکان)دا چاکتر ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە کەبریتی‌یە لە (ئیسلام وریاکەرەوەیە نەك تلیاك)، دیارە ئەم (سۆزی نەتەوایەتی)یەش ئاڵقەی چوارەمی (ئیسلام و ڕێچکان)ە.

جا هەرچی دەوڵەتی فارس بوو، پڕ پڕ بوو لەبیروڕاو فەلسەفەی جۆراو جۆرو پێکەوە دژ، لەدەولـەتی فارس دا ڕێچکـەی زەردەشتایەتی بـاو بـوو، کـە کاربەدەسـت و دەسـەڵاتدارەکان نوێنەری بوون و یەکێك لەپایە فەلسەفی‌یەکانی ئەوەبوو کەژنهێنانی پیاوی لەنێو نزیکانی وەك دایك و کچ و خوشك بەچاکتر دادەنا وەك لەخزمی دوورو بێگانە!! تەنانەت (یزد جرد)ی دووەم کە لە نیوەڕاستی سەدەی پێنجەمی زایینی‌دا حوکمی دەکرد، کچەکـەی خـۆی هێنـا، ئەمـەو بێجگە لەزۆر لـەڕێ لادان و ناکاری دزێوو ڕەفتاری بەدی دیکـەی جۆراو جۆر کەمەودای باس کردنیان نیە[1] .

دیسان لەنێو فارس دا ڕێچکـەی (مانـەوی) هـەبوو، کەبنچینـە فەلسـەفی‌یەکەی بریـتی بـوو لەخراپە حسێب کردنی بوونی مرۆڤ (وجود الانسان)، لەبەر ئەوە دەیگوت پێویستە مرۆڤ نەهێڵرێ، بۆیە ژن هێنانی قەدەغە کردبوو تاکو زاوزێ نەمێنێ[2] !

یـەکی دیکـە لـەبیرو فەلسـەفەکانی فـارس بریتی‌بـوو لەڕێچکـەی (موزدەکـی) کـەوەکو شەهرەستانی دەڵێت فەلسەفەکەی بریتی بوو لەحەڵاڵ کردنی ئافرەتـان و سامان و دارایـی‌و هەموو شتێك بۆ هـەموو کەسێك بەیەکسانی‌و هاوبەشی بێ جیاوازی، واتـە: (شيوعية النساء والأموال).

بـەلام دەولـەتی ڕۆم، گیـانێکی دیکتاتۆرانـە خـۆی بەسـەردا سـەپاندبوو، وەزۆر شـەپڕێوو سەغڵەت بوو بەهۆی ئەو دووبەرەکی‌یە ئایینی‌یەی کەلەنێوان دیانەکانی شام و میسردا هـەبوو، وە ئـەم دەوڵەتـە پشـتی بـەهێزی سـەربازی‌و داگیرکەرانـەی خـۆی بەسـت بـوو لـە پێنـاوی گەشەپێدانی ئایینی مەسیحی‌و دەستکاری کردنی بەگوێرەی هەواو ئارەزوو.

بێگومان ئەمیش لەدەوڵەتی فارس کەمتر شل و شێواوو بێ سەرەوبەرە نەبوو لە ئەنجامی پەرەسەندنی ژیانی پڕ عەیش و نۆش و خۆش گوزەرانانەداو، بەهۆی ستەمی ئابووری‌یەوە کە لەدانیشتوان دەکرا، لەڕێی سۆغرەو بێ گارو باج و سەرانە سەندنەوە.

یۆنانیش لەنێو گێژاوی ئەفسانەو بیروبۆچوونە فەلسەفی‌و خەیاڵی‌یەکانیدا نقوم بوو بوو بێ ئەوەی پێیان بگاتە بەرهەم و ئەنجامێکی بەکەڵك[3] .

---

(1) (فقه السيرة) ی محمد رمضان البوطي، ل٣٧.

(2) (خاتم النبيين) ی محمد ابو زهرة، ب١، ل١١.

(3) (فقه السيرة) ل٣٨.

هیندیش، وەك مامۆستا (ابو الحسن الندوي) دەڵێت هەموو مێژوونووسانی هیند لەوەدا قسەیان یەکە، کە ئەو سەردەمەی هیند بە دواکەتووترین قۆناغی دەژمێررێ لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، چ ئایینی چ کۆمەڵایەتی چ ڕەوشت و ئاکار، وەهیندیش لەگەڵ دراوسێی و دەستە خوشکەکانی‌دا بەشدار بوو لە ڕووخانی ڕەوشتی‌و کۆمەڵایەتی‌دا[1].

ئەمە بەکورتی حاڵ و باڵی هێزە دەسەڵاتدارەکانی جیهان بوو، لەسەروحەدی هاتنی ئیسلام دا، ئینجا بابزانین دوورگەی عارەبی (الجزيرة العربية) لە چ حاڵێکدا بوو.

لەوکاتی‌دا دوورگەی عارەبی هێدی‌و ئارام بوو و، دوور بوو، بگرە هەر ڕووت بوو لەو هەموو ئاڵۆزی‌و بێ سەرەو بەرەیی‌یەی جیهان، چونکە دانیشتوانی نەشارستانەتی‌و ڕابواردن و خۆش گوزەرانی دەوڵەتی فارسی‌یان هەبوو، کە بەرەو ڕووخان و ڕەوشت نزمی‌و[2] فەلسەفەدانان وریچکە داتاشینیان بەرێ، وە نەدەسەلآت و هێزی سەربازی ڕۆمیشیان هەبوو کە بتوانن دەست درێژی بکەنە سەر وڵاتانی دەوروبەریان، وە نە وەك یۆنانی‌یەکان دەرفەتی فەلسەفەچی‌یەتی‌و دم بەدمەو وتو وێژی قووڵیان هەبوو، تاکو مێشکیان ببێتە نێچیری خەیاڵ و ئەفسانەکان.

سروشت و نەفسی عارەبەکان لەو سەردەمی‌دا زۆر وەك کەرەسەیەکی بەکارنەهاتووی خاو دەچوو کە لە هیچ قالب و بۆتەیەکدا قاڵ نەکرابێتەوە[3].

کەواتە: گەلی عارەب لەو سەردەمی‌دا لەهەموو گەلانی دیکە گونجاوترو لەبارتر بوون بۆ ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا.

**دووەم:**

وەك پێشتر گوتمان گەلی عارەب گەلیکی سادەو نەخوێندەوارو سەرگەردان بوو، جا هەڵبژاردنی دوایین پێغەمبەرﷺ لەنێو گەلیکی ئاوادا، هەم دەبێتە بەڵگەیەکی دەم کوتکەر بۆ کەسانێك کەبیانەوێ تانەو تەشەر لە پێغەمبەرﷺ بگرن و بڵێن: ئەم قورئانە ئی خوا نیەو بۆ خۆی دایناوە، یان لەئەنجامی زانیاری‌و خوێندەواری‌دا فێری بووە، وەك قورئان دەفەرموێ

---

[1] (ماذا خسرالعالم بانحطاط المسلمين) ی ابو الحسن الندوي، ل٢٨.

[2] بێگومان عارەبەکانیش ڕەوشتی نزمیان زۆر بوو، بەلآم ڕەوشت لەسەر ئاستی دەوڵەت، یان چەند تاکێك لێك جودان.

[3] (فقه السيرة) ل٣٩.

﴿وما كنت تتلو من قبله من كتاب ولا تخطه بيمينك إذاً لارتاب المبطلون﴾ العنكبوت (٤٨)، واتە: وە تۆ -ئەی پێغەمبەرﷺ- لە پێش ویدا هیچ کتێبێکت موتالاً نەکردوەو هیچت بە دەستە ڕاستت نەنووسیوە، ئەگەر وابایە لاڕێ بووان دەکەوتنە گومانەوە؛ (واتە: بیانووی کەوتنە گومانیان بەدەستەوە دەبوو).

وە نێررانی ئیسلام لەنێو گەلێکی سادەو نەخوێندەواری وەك عارەب دا دەبێتە موعجیزەیەکی مێژوویی بۆ ئیسلام، چونکە ڕەنگە ئەگەر لەنێو گەلێکی خاوەن شارستانەتی وەك فارس، یان خاوەن سوپاو دەسەلاتی وەك ڕۆم، یان خاوەن فەلسەفەی وەك یۆنان دا نێررابا، هەزار کەس گوتبای: کوڕە کاکە خۆ ئازایەتی ئیسلام نەبوو کە لە نێو ڕۆم یان فارس یان یۆنان دا دەوڵەتی دروست کرد، بەڵکو هەر ئازایەتی ئەو دەوڵەتە خۆی بوو! بەڵام ئایا ئێستا بێجگە لە ئازایەتی‌یەکەی بۆ کێ دەگەڕێتەوە؟!!

**سێیەم:**

دورگەی عارەبی هەرچەندە مەیلەو لاپەڕ کەوتوە، بەڵام کەرتی ئاسیاو ئەفریقیا پێکەوە دەبەستێ‌و لە ئەورووپاشەوە دوور نیە، جا ئەگەر بێت و ئاستی هۆیەکانی هاتووچۆی ئەودەمی لەبەرچاو بگرین هەست بە گرنگی‌و بایەخی جوغرافیایی ئەو شوێنە دەکەین و پەی بە حیکمەت و کاربەجێ‌یی خوای زانا دەبەین.

ماقووڵیش نیە ئێمە هەموو شتێك هەر لە گۆشەنیگای چاخ و سەردەمی خۆمانەوە سەیر بکەین و لە هەمبانەی خۆمان دا گوێزان بژمێرین!

**چوارەم:**

کابەی پیرۆز (البيت الحرام) کە دەستکردو شوێنەواری ئیبراهیم پێغەمبەرەﷺ، پلەو پایەو حورمەتێکی زۆری هەیە لە دڵی هەموو گەلانی خواپەرست دا، چونکە ئیبراهیم بە بابی پێغەمبەران (ابو الأنبياء) ناسراوەو ڕێزی لەکن هەموو خواناسانی جیهان هەیە، هەڵبەتە ئەو شوێنە پیرۆزەش لە کۆکردنەوەو ڕاکێشانی دڵی خەڵکی‌دا بایەخی هەبووە.

**پێنجەم:**

نەتەوەی عارەب هەرچەندە سادەو نەخوێندەوارو نەزان بوون و ڕەوشت و خووی دزێوی ناڵەباریان زۆر بوون، بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە:

گەلی عارەب لە سۆنگەی ئەوەوە کە نیشتیمانێکی هەتا بڵێی بێ خێرو کەم دەرامەت و قاقڕو دیمەکاریان هەبوو، هیچ کام لە هێزە زەبەلاحە جیهانخۆرەکانی ئەو کاتە چاوی تێ نەدەبڕی‌و پەلاماری نەدەدا، بۆیە پارێزراوو چەپاڵەدراو بوون و لە بارودۆخێکی یەکجار ئازادو سەربەست دا بە ژیانێکی هەتا بڵێی سادەو کەم مەسرەفەوە دەژیان، هەر ئەوەش بوو کەوای لێ کردبوون لەسەر زەمینەی نەتەوایەتی کۆ نەبنەوەو، هەر بەتیرەیی‌و پرژوبلاوی بمێننەوەو، کەس گەردن کەچی کەس نەبێ‌و، هەر کەسە کوێخای گوندی خۆی بێ، جا لەبەر ئەوە ئەو دوورگە دوورە پڕ لە ئازادی‌و سەربەستی‌یە باشترین و گونجاوترین جێگای تێدا شین بوون وفراژوو بوونی ئەو ئەمامە ئیسلامی‌یە بوو، کە بۆ خۆی ئامانجی ڕزگار بوون و ئازادکردنی بەندەکانە، چونکە بیروباوەڕێکی ئەوتۆ لەبارودۆخێکی ئازادو سەربەستدا نەبێ زۆر بەزەحمەت گەشە دەکات و دەخەملێ!

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو عارەبە بیابانی‌یانە بەحوکمی ژیانی دژوارو سەختی دەوارنشینی‌و ڕاوچی‌یەتی‌و ماڵات ڕاگری‌یان و، بەحوکمی هەل و مەرجی سەخت و بەزەحمەتی ژیانی بیابانی‌یان، زۆر خەسڵەتی وەك: ئازایەتی، خۆڕاگری، پشوودرێژی قەناعەت، فیداکاری‌و، بەرچاو تێری‌یان تێدا بوون، کە لەبەر نەبوونی بەرنامەیەکی ڕێك و پێکی ژیان، گەلێك جاران ئەم خەسڵەتە چاکانە لەڕێیەکی هەڵەو چەوت و بەمەبەستی خراپەوە بەکار دەهێنران.

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتانەش زۆر پێویستن بۆ کەسانێك کە دەیانەوێ ئایین و بەرنامەی خوا لەسەر زەوی بچەسپێنن و بەجیهانی ڕابگەیەنن.

**شەشەم:**

ئەگەر بەوردی لەزمانی عارەبی ورد بینەوە، دەبینین زمانێکی تێرو تەواوەو چەند تایبەتمەندی‌یەکی تێدا هەن کە لە هیچ زمانێکی دیکەی جیهاندا بەدی ناکرێن، لەسۆنگەی ئەمەوە: جێی خۆیەتی زمانی عارەبی بکرێ بەزمانی گشتی ئیسلام و مسوڵمانان، کەواتە:

لەبەر ئەم حیکمەت و هۆیانە بوو-ڕەنگە ئی دیکەش هەبن- کە خوای کاربەجێ لەنێوە دورگەی عارەبی‌داو لەنێو نەتەوەی عارەب دا بەزمانی عارەبی دوایین بەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانە کرد، مادام وابێ ئەو عارەبە ناسیۆنالیستانەی کەشانازی‌و فیز بەسەر گەلاندا دەکەن و لاف ئیمتیازو زێدەیی‌یان بەسەردا لێ دەدەن، قسەیەکی بێ بەڵگە دەکەن و، عادەتی

هەڵەی شەیتانی بەد ڕەچاو دەکەن کەخۆی بە توخم و ڕەگەزەوە هەڵدەکێشاو کەشخەی بەسەر ئادەم دا لێ دەدا، بەلأم سەرەنجام لەبەر ئەو خەسڵەتی خۆ هەڵکێشان و لووت بەرزیو خۆبەزلگرییە نەك هەر بەرز نەبۆوە، بەڵکو نەفرینیشی لێ کراو تڕۆ کراو سووك و ڕیسوا بوو و دووچاری تووڕەییو تۆڵەو جەزرەبەی توندی خوداش بوو!

کەواتە: با ئێمەش هەرنەبێ پەند لە ڕابردووان وەربگرین و، ئاگاداربین بەمەرەدی وان نەچین! باتێکرا بەرەو ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بگەڕێینەوە، وەك پێشینە ڕەسەنەکانمان باوەش لە ئیسلام وەربێنین و، واز لە هەموو ڕێچکەو کوێرە ڕێیەك بێنین و چیدی بەتەمای بیردۆزەی بێخێر خۆمان و خەڵکیش بەدیار خەیاڵ پڵاوانەوە مەحتەل و دەسخەڕۆ نەکەین!

خوای بەرزو مەزن و دادگەرو میهرەبان بەلوتف و بەزەیی خۆی هەموو لایەکمان بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی ڕێڕوونی بکاو، وامان لێ بکات کارێك بکەین کە لەوە بوەشێینەوە زەوی خوا بەمیرات بگرین و بەمرادی دنیاو دواڕۆژان بگەین.

وما ذلك على الله بعزيز.

## ٣- توانج و پلار لەئیسلام گرتن بەزیانی کێ تەواو دەبێ؟!

ئەو کەسانەی کە تانەو تەشەرو توانج و پلار دەگرنە ئیسلام و ناڕەزایی بەرانبەر دەردەبڕن و، لەو لاشەوە خۆیان بە دڵسۆزی کورد دەزانن، با زۆر چاك بزانن کە بەو ڕەفتارەیان گەورەترین زیان لەو گەلە کوردە دەدەن، کە خۆیان بەخەمخۆرو مشورخۆری دەزانن! چونکە پلار و توانج لە ئیسلام گرتن، واتە: پلارو توانج گرتنە مێژووی (١٤٠٠) ساڵەی گەلی کورد! دەبا تێفکرین!

گەلی کورد بێجگە لەو مێژووە (١٤٠٠) ساڵەییە کە لەژێر باڵی ئیسلامدا بردوویەتە سەرێ، کوا چ مێژوو و داستانێکی دیکەی هەیە کەمایەی شانازیو سەربەرزیی بێ و، مایەی ڕێز لێ گیرانی بێ لەلایەن گەلانی جیهانەوە!!

بەڵێ! گەلی کورد تەنها پشك و بەشێکی -بەرچاو- کە هەیبێ لە مێژووی مرۆڤایەتیو مێژووی ژیانیداو، جێی شانازیو سەربەرزیو هۆی پێوە ناسرانی بێت لەلایەن گەلانەوە،

بەس ئەوەندە ژیانەیەتی کە لەنێو باوەشی گەرمی خواناسیو بن سێبەری درەختی پڕ پیت و پێزی ئیسلام دا بردوویەتە سەر، جا مادام وابێ دارنینی ئەو ژیانە ئیسلامییانەی گەلی کورد – کە لەئەنجامی ڕازی نەبوون بەئیسلامدا دێتە کایەوە– لەمێژووی ژیانی، دەبێتە دابڕانی گەلی کورد لەکاروانی مرۆڤایەتیو خستنە گۆڕی گەلی کورد وەك درەختێکی بێ ڕەگ و ریشەو بەرهەم و، وەك گەلێکی بێ خزمەت و هیچ دەبارانداندا نەبوو و نارەسەن و بێ بنەچەکە[1] !!

کەواتە: هۆ برادەرە ناسیۆنالیستە کورد پەروەرەکان!

چیدی هێرشی کوێرانەی بێ سەروپێ مەکەنە سەر ئیسلام و، چیدی بەرهەمی ئەدەبی نووسەرە پێشووە مسوڵمانەکانی وەك: خانیو مەلای جەزیریو نالیو حاجی قادرو مەحویو

---

[1] نابێ لێرەدا کەس ئەوە لەم قسانەم بفامێتەوە، کەئێمە هەمیشە پشگیری شتی کۆن و ڕابردوو دەکەین و پێشگیری لەبیرو بۆچوون و شتی نوێو تازەبابەت و هاوچەرخی بەسوود دەکەین –بێگومان ڕەنگە کەسانێکی واش هەبن بەڵام بەپێی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرﷺ بەهەڵەدا چوو ون– بەڵکو ئێمەش دەڵێین: پێویستە شتی کۆنی بێ بایەخ و کات بەسەرچوو وەلابنرێو وەك کەلەپوورو شوێنەوارێکی مێژوویی لە مۆزەخانەدا دابنرێ، بەڵام سوپاس بۆ خوا کە هێندەشمان هۆش و گۆش هەیە بزانین، نەهەموو شتێکی کۆن بێ سوودو کەم بایەخەو، نەهەموو شتێکی نوێو تازەبابەتیش چاك و سوودبەخشە، جا ئێمە دەزانین کە (١٤٣٠) ساڵ پتر بەسەر ژیانی ئیسلام دا ڕەت بووە، بەڵام بڕوامان وایەو دەشتوانین بۆ هەموو کەسی ژیرو بەویژدانی بسەلمێنین، کە ئیسلام یەکێکە لە شتە کۆنە گرنگ و بایەخ دارەکان و کۆن بوون بۆتە مایەی پتر بەپێزبوونی.

بەڵام ئەوانەی کە بە ئیسلام نارازین نەدەتوانن ڕەخنەیەکی بەجێی لێ بگرن و دەری بخەن کە ڕاستە شتێکی کۆنی بێ بایەخە، وەنە شتێکی نوێی چاکتریشیان بۆ کورد هێناوە کە جێی ئیسلام بگرێتەوە.

بەڵێ! ئاگادارین و دەزانین کە دەستەیەك لەو بەناو ڕۆشنبیرانەی بەشیری گوانی ئیمپریالیزمی جیهانی فرچك دراون، برێك بیردۆزەو بیرو بۆچوونی بێ سەرەو بەرەو قرپۆك و بێ پێزیان هێناوە، بەئومێدی ئەوەی جێ بەئیسلام لەق بکەن، بەڵام وادیارە بێ ئاگان لەوەی کە ئەو بیروبۆچوونانە وەك قوماشی ناجسن لەمێژە سپات بوونەوەو لەو جێیانەدا کە تێیاندا لەدایك بوون ئیفلاسیان کردوە، شتیش کە ڕەنگی خۆی بەردا، بۆیەکردنەوە دادی نادات و، دیارە (ئەگەر لە سووریش تێ چووی لە لابای بۆت تێ هەڵنایەتەوە).

مەلای گەورەو... هتد مەدەنە بەر نشتەری تەئویل و تەئویلکاری، بەمەبەستی ئیسلام داڕنین لە بەرهەمە نایابەکانیان و بە نامسوڵمان حسێب کردنیان، چونکە:

١- کافرکردنی وان و ئیسلام داڕنین لە بەرهەمەکانیان، هیچ گۆڕانێک بەسەر ئەو قۆناغە مێژوویی‌یەدا نایەنێ، کە کاتی خۆی تێیدا ژیاون!

٢- کورد بەس مێژووی ئیسلامی هەیە، کە پێیەوە سەربڵندو نێوچاوان بەرز بێ‌و، کورد تەنها لەڕێ‌ی خزمەتکردن بە ئیسلامەوە -هەروەها هەموو گەلانی مسوڵمانی دیکەش- ئیسپاتی هەبوونی خۆی لە مێژوودا کردوەو خۆ ئەگەر ئیسلامیشی لێ داڕنین ئەوا هێندەی دیکە کەساس و زەبوون دەبێ!!

٣- وە بە کافرکردنی وانیش هیچ خێرو بەرەکەتێك ڕوو لەواقیعی ئێستای گەلەکەمان ناکات!!

جا قسەی کۆتاییم لەگەڵ ئەو برادەرە کورد پەروەرانەدا ئەوەیە:

ئەگەر قازانجی گەلەکەتانتان دەوێ‌و خۆشتان دەوێ -واشتان لێ چاوەڕوان دەکەین- دەست لەو کارەتان هەڵبگرن کە گەلی کوردی پێ نارەسەن و بێ ئەسڵ و فەصل و بێ ناوونیشان دەکرێ، چونکە ئێوە ڕاست وەك مەلای مەزبوورەتان لێ هاتوە، کە دەڵێن خەریکی بڕینەوەی لاخە دارێك بوو، بەڵام ئەو لاخەی جێ‌ی مەبەستی بوو هەر لەسەر ویش ڕاوەستا بوو، بۆیە کاتێك سێ چوار بیوری[1] لێدان لە پێش لاخە دارەکەی‌دا کەوتە خوارێ‌و لەپێش هەموو جێ‌یەکی‌دا پاشەسەری وەزەوی کەوت!!

جا بێگومان هەر کەسێك بیەوێ دارێك ببڕێتەوە کە لەسەری ڕاوەستاوەو ڕای گرتوە، بەمەرەدی مەلای مەزبوورە دەچێ!!

وەئەگەر مەبەستیشتان لێدانی کوردی مسوڵمان و زیان پێ‌گەیاندنیەتی بەهۆی بێ بنەچەکە پێشان دان ورەگ و ڕیشە دەرهێنانی‌و بێ ناوونیشان کردنی‌یەوە -ئیشەڵڵا واش نین-، ئەوە پێتان دەڵێم: دەك خوا لێتان هەڵنەگرێ بۆ خۆتان و ویژدانتان!!!

---

[1] بیور: تەور.

## ٤- ئایا ڕاستە (صلاح الدین) سەبارەت بەگەلەکەی کەمتەرخەم بووە؟

هەندێك لەوانەی لەناو گەلی کورد دایم و دەرەم بەخەم و پەژارەوە دەتلێنەوەو، دڵ و هەناویان لەسۆزو ئەوینی کوردو کوردستان هەموو دەمێ وەك تەندووری دەسووتێ"!! هەر کەسێ ئیسلامت بۆ کردن و پێت گوتن:

با بگەڕێینەوە بۆ بەرنامەی خوا چونکە ئێمە بەندەی خواین و بێجگە لە خواپەرستی هیچی دیکە لە ئێمەی بەندە ناوەشێتەوە، دیسان بەس بەرنامەی خوایە کە بتوانێ دەفریامان بێ‌و ئاواتەکانمان بهێنێتەدی، پێت دەڵێ:

جا کوا ئیسلام چی بۆ گەلی کورد کردوە، مەگەر (صلاح الدین) کورد نەدەبوو! دەی خۆ سەرکردەی دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامی بوو ئەدەی بۆچی هیچی بۆ کورد نەکرد!

لەوەلأمدا دەڵێین:

خاوەنی ئەم پرسیارە لە گێژاوی نەزانی‌و بێ ئاگایی‌یەکی بێ ڕەزادا نوقم بووەو پەلەپتە دەکات، چونکە هەم سەبارەت بە واقیعی مێژوویی کۆن و نوێ بێ ئاگایەو، هەم سەبارەت بە واقیعی ئایینی ئیسلام!

دەربارەی مێژوو شارەزا نیە، دەنا دەبوو گلەیی لە (صلاح الدین)ێك نەکات (٨٠٥ ساڵ لەمەوبەر مردووە)[1] !

چونکە ئاشکرایە لەوسەردەمی‌دا -واتە لەسەدەی شەشەمی کۆچی‌دا- ڕوانگەی تێڕوانینی شتان بەس ڕوانگەی بیروباوەڕ بوو، بێگومان مسوڵمان و نامسوڵمانیش لەمەدا یەکسان بوون ئەگەرنا بێجگە لە بیروباوەڕ چ شتێك دەیتوانی هەر کام لە (فریدریکی یەکەم) ئیمپراتۆری ئەڵمانی‌و، (فیلیپ ئۆغستس) مەلیکی فەرەنساو (شێردڵ ڕێکاردۆس) مەلیکی ئینگلتەرا ڕازی بکات کە خاچ بەبەر خۆیاندا بکەن و لەسەر دەستی پاپا لەدژی ئیسلام ڕێك بکەون[2] ؟!

دیسان ئەگەر بیروباوەڕ نەبا چ شتێك دەبوو بەهۆی خڕ بوونەوەی مسوڵمانان لەکوردو عەرەب و تورك و... هتد لەژێر ئالأی سەرۆکێکی کورددا؟!

---

[1] (صلاح الدين الايوبى) لەساڵی (١١٣٨) ی زایینی لەدایك بووەو لەساڵی (١١٩٣) ی زایینی کۆچی دوایی کردوە.

[2] (تاریخ الشعوب الإسلامیة) ی کاڕل برۆکلمان، ل٣٥٧.

بێگومان هەروەك چۆن ئێستا (ناسیۆنالیزم) لەگۆڕێ دایەو ئینجا جەنابی هەتا ئێستا -كە حەفتا ساڵ پترە دەهۆڵی بۆ دەكوترێ- تەنانەت نەیتوانی ئیوە گەلێكی وەك عارەبیش لەنێو خۆیدا بكاتە یەك، چ جای هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، ئەگەر هاتباو ئەو دەمیش ئەو نەتەوەپەرستی‌یە لە گۆڕێ دابایە، نە (صلاح الدین) وە نەهیچ یەكێكی دیكە لە سەرۆك و گەورەی مسوڵمانان نەیان دەتوانی وا بەسێنایی حوكمڕانی ئەو ئۆممەتە ئیسلامی‌یە بكەن كە لەدەیان تیرەو نەتەوەی جۆراو جۆر پێكهاتبوو و هەموو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی وەبەرخۆ دابوو.

كەواتە ئەو كەسەی لە (صلاح الدین)ێكی (٨٠٠) ساڵ زیاتر لەمەوبەر چاوەڕێی شۆڕشێكی نەتەوەیی دەكات، یان چاوەڕێی سەركردەیەكی مسوڵمانی هەشت سەدە لەمەوبەر دەكات، كە بۆی باسی مەسەلەیەك بكات، كەساڵی لەدایك بوونی (١٧٨٩)ی زایینی‌یە[1]، وەك ئەو كەسە وایە كە چاوەڕێی دار تووەكەی بەرماڵانە لەزستانی‌دا بۆی بێتە بەر!!

ئاخر هۆی برادەر گیان!

هاتنەدی هەر شتێك پەكی لەسەر ڕەخسان و ئامادەبوونی هەل ومەرج وبارو دۆخێكی پێویست و گونجاو كەوتوەو بەبێ ڕەخسانی ئەو هەلّ و مەرج و بارو دۆخە، چاوەڕوان كردنی بەڵگەی نەفامی‌و زەین كوێری‌و سادەیی‌یە.

ئەوە هەمووی لەلایەكەوە، لەلایەكی دیكەشەوە وادیارە خاوەن پرسیار قیاسی كەشكێ لە مەشكێ كردوە، وادەزانێ ئەم بارودۆخە ناقۆڵاو پڕ زۆرو ستەمە نەتەوایەتی‌یەی ئەم تێیدا دەژی، هیچ ڕووی لەو واقیع و بارو دۆخەی گەلی كوردی (٨٠٠) ساڵ بەر لەئێستا وەرنەگێڕاوەو یەك بیچمن!

بەڵام لەو پێك گرتن و بەراورد كردنەی‌دا هیچ گومان لە بەهەڵەدا چوونی‌دا نیە، چونكە بارودۆخ و واقیعی سەردەمی خاوەن پرسیار[2]، دێوی دزێوی ڕەگەزپەرستی‌و نەتەوەپەرستی (ناسیۆنالیزم) باڵی ڕەشی بەسەردا كێشاوەو ژیانی لە مرۆڤ كردۆتە ژاری مار، بەڵام ژیان لەبن سێبەری دەوڵەتی ئیسلامی (٨٠٠) ساڵ لەمەوبەردا، هەیهوو هەیهوو جیاوازی زۆرە، چونكە

---

[1] چونكە زۆربەی توێژەرە سیاسی‌و مێژوو زانەكان لەسەر ئەو ڕایەن كە بیری ناسیۆنالیزم وەك ڕێچكەیەكی سەربەخۆ، لەدوای شۆڕشی فەرەنساوە سەری هەڵدا، بڕوانە: (ملیگرایی در اسلام)، ل١٢.

[2] كەواقیعی ئێستایە.

لەو سەردەمەدا هیچ کام لە ڕەنگ و دەنگ و قەبارەو سەنگ و جوگرافیای نەنگ.. وەکو ئێستا نەکرابوونە سنووری لێک دابڕین و قڵت و بڕکردنی تیرەو گەلەکان، بەڵکو سنوری تێدا کۆبوونەوەو زەمینەی لەسەر خڕ بوونەوەو تەرازووی هەڵسەنگێنران و لێک جوێ بوونەوە تەنها ئیسلام بوو!!، کەواتە مسوڵمانەکان بەهەموو تیرەو نەتەوەکانیانەوە تائەندازەیەکی زۆر وەك یەك و یەکسان بوون و کەس هەستی بەوە نەدەکرد کەمایەتی‌یەکەو جیاوازی لەگەڵ دەکرێ‌و مافی بەزایە دەدرێ‌و کەسایەتی پێ شێل دەکرێ.

جا بێگومان لەژێر سێبەری دەوڵەتێکی[1] ئاوادا نە هیچ کەسێکی مسوڵمان لە گەلی کوردو غەیری کوردیش خوتخوتەی نەتەوایەتی بەدڵدا هاتوە، وە نە دەسەلاتدارێکی وەك (صلاح الدین)یش هەستی بە بەشخوراوی‌و بەجێماوی نەتەوەکەی کردوە، تاکو ئەو هەستە پاڵی پێوە بنێ شتێك بە شتێك بکات.

ئێستا کە هەتا ئەندازیەك زانیمان خاوەن پرسیار چەند لە واقیعی مێژوویی بێ ئاگایە بابچینە سەروکاری شارەزایی وی‌و هەرکەسێکی دیکەی هاو وێنەی، سەبارەت بە ئیسلام:

هەموو ئەو کەسانەی گلەیی لە (صلاح الدین) دەکەن چونکە هەڵنەستاوە بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی کوردانەی ناسیۆنالیزمانە نەك هەر بە ئیسلام نەشارەزاو ناناشنان، بەڵکو تەنانەت ئەلف وبێ‌ی ئیسلامیشیان نەخوێندوە.

بەڵێ! یەکێك لەبەڵگە نەویستە زۆر بەرچاوەکانی ئیسلام ئەوەیە، کە ڕێ بەبابای مسوڵمان نادات هیچ کام لەڕەنگ و زمان و نیشتیمان و پارەو سامان و ڕەچەڵەك و... هتد بکاتە سەنگی مەحەك و تەرازووی لێك هەلاواردنی بەندەکان -وەك لەم وتو وێژەدا بەدوورو درێژی باسکرا- کەواتە: هەڵنەستانی (صلاح الدین) بە شۆڕشێکی نەتەوەیی‌یانە لە چوارچێوەی گەلی کورددا لەبەر ئەوە بووە کە ئایین و بیرو باوەڕەکەی ڕێ‌ی نەداوەو ئەگەرگریمان ڕێگاشی‌دابایە بۆی نەدەکرا -وەك دواتر باسی دەکەین- و ئەگەر گریمان بۆشی کرابایە لەو ڕۆژگارەدا پێویستی

---

[1] شتێکی ڕوونە کەلەپاش چاخی زێڕینی چوار جێ‌نشینەکان بەڕێوەبەرانی دەوڵەتی ئیسلامی کەم و زۆر بێ‌دادی‌و ستەم و زۆرو ڕەچەڵەك پەرستی‌یان ژیاندوەو لەسەر حیسابی گەلی هەژار شەپ و گوپیان لێ دەدا، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین هیچ کام لە دەوڵەتانی ئێستای سەدەی بیست لەگەڵ دواکەوتووترین چاخی دەوڵەتی ئیسلامی لە دوو پێ‌ی تەرازوودا پێك هەڵسەنگێنین.

بەکارێکی وا نەبووە[1] ، واتە: زانیویەتی کە ئیسلام لەڕوانگەو ئاسۆیەکی پان و بەرینەوە سەیری مرۆڤەکان دەکاو، لەمرۆڤی مسوڵمان ڕازی نابێت لە قەپێلکی گچکەو کەمبەری تیرەو گەلەکەیدا خۆی ڕێك بێنێو لە قوژبنێکی جیهانی بەرفراواندا خۆی کوشمەڵە بکات و گۆشە گیر بێ.

ئینجا سەیر لەوەدایە کە ئەوخەسڵەتەی ناسیۆنالیستەکان (صلاح الدین)ی پێ تاوانبار دەکەن و پێیان وایە بەهۆی نەبوونی ئەو خەسڵەتە لەو شۆڕە سوارەدا پلەو پایەی پێی دابەزیوە، بەرزترین درووشمی کەسایەتی‌یەتی‌و ئەگەر خوانەخواستە ئەو خەسڵەتەی تێدا بووایە قەت نەدەگونجا ببێ بەو قارەمانە لێهاتووە کەدۆست و دوژمن ڕێزی دەگرن و ستایشی دەکەن، بۆ ڕاستی ئەم قسەیەشم بەس دوو بەڵگان دەخەمە بەرچاوان:

**یەکەم:**

ئەگەر (صلاح الدین) بابایەکی ناسیۆنالیست و نەتەوەپەرست بووایە بۆی نەدەلوا سەرکردایەتی بە هێزترین سوپای ئیسلامی ئەو سەردەمە بکات کە زۆربەی گەلە ئیسلامی‌یەکانی تێدا بەشدار بوون، چونکە ئەگەر ئەو ئالأو درووشمی کوردایەتی بەرزکردبایەوە، عارەبەکانیش ئی عارەبایەتی‌و تورك ئی تورکایەتی‌و فارس ئی فارسایەتی‌و... هتدیان بەرز دەکردەوە!

کەواتە: ئەوانەی ڕەخنە لەو هەڵکەوتووە مسوڵمانە دەگرن، حەزدەکەن کاتی خۆی وازی لەسەرکردایەتی سوپای ئیسلامی‌و حوکمڕانی میسرو یەمەن و شام و جەزیرە[2] هێنابایەو،

---

[1] لێردا ڕەنگە هەندێك کەسی گێل، یان خۆ گێل کەر هەبن بڵێن: کەواتە ئیسلام بڕوای بەمافە نەتەوایەتی‌یەکانی گەلان نیە!! بەڵام بەو کەسانە دەگوترێ: (مافی نەتەوایەتی) لەگەڵ (نەتەوەپەرستی)دا لێك جودان، ئیسلامیش دان بە ئی یەکەمیاندا دێنێ، بەڵام دووەمیان جۆرێکە لە بت پەرستی‌و لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە.

ئینجا بێگومان ئەگەر حاڵ و وەزعی گەلی کوردیش لەسەردەمی ئەییوبی‌یەکان دا وەك ئێستا بووایەو چەوساوەو ماف زەوتکراو بووایە، ئەوە (صلاح الدین)یش وەك هەر مسوڵمان و ئیسلامی‌یەکی شۆڕشگێڕی ئەمڕۆ هەڵوێستێکی دیکەی دەبوو، چونکە (لكل مقام مقال).

[2] جەزیرە ناو بووە بۆ بەشێکی زۆری کوردستانی ئێستا.

دەوڵەتۆکەیەکی کوردی دامەزراندباو، خۆی لە چواچێوەی تەسکی نەتەوەیی‌دا ڕێك هێنابایە[1] !
بەڵام بەوەی چاك بوو ئەو حەزەی وان نەهاتەدی، دەنا نەك هەر گەلی کورد، ئیسلام و جیهانیش
لەو شۆڕە سوارو ڕابەرە دادگەرو سەرکردە دڵنەرمە بێ بەش دەبوون.

**دووەم:**

وەنەبێ بیری ناسیۆنالیزمی هێندە دیاردەیەکی سوودبەخش و سەربەخێر بووبێ، تاکو (صلاح الدین) لەسەر گوێ پێ نەدانی لۆمەو سەرکۆنە بکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەوەی چاك بوو کە ئەو کوردە مەردە گیرۆدەی ئەو دەردە پیسە نەبووە دەنا لەجیاتی ئەوەی ببێتە جێی سەربەرزی کوردان ومایەی شانازی‌یان بە بەراوەژووەوە ئەو مسوڵمانە بەرزە دەبوو بە پەڵەیەکی ڕەش ودزێو بەسەر لاپەڕەکانی مێژووی گەلی کوردەوە[2] ، چونکە لەوەتی بیری ناسیۆنالیزمی جیهانی تەنیوەتەوەو گەرای پیسی لە دڵ و مێشکی تیرەو گەلانی جیهان داناوە، سەرلەبەری

---

[1] هەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانەی کە ڕەخنە لە (صلاح الدین) دەگرن و دەڵێن: دەبوو وازی لە سەرکردایەتی سوپای ئیسلام و سەرۆکایەتی گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامی ئەو سەردەمە هێنابایەو، لەجوغزی تەسکی کوردستاندا خۆی کورت هەڵهێنابایە، وەك هەڵوێستی ئەوانەم دێتە بەرچاو کەداوا لەبابایەکی سەرۆك کۆمار یان پارێزگار (محافظ) دەکەن، واز لە سەرۆك کۆماری‌و پارێزگاری‌یەتی بهێنی‌و، چونکە کاتی خۆی خەڵکی دێی (خوڕخوڕە) بووە، بێتەوەو ببێتە کوێخای دێی ناوبراو!!

تێبینی:

(خوڕخوڕە) دێیەك بوو لەناوچەی جافەتی نزیك ناوچەی مەرگەی پارێزگای سلێمانی بەشە کوردستانی سەر بە عێراق، کە بەپێی نەخشەو پیلانی کاولکاری ڕژێمی بەعسی کافر دووجاران خاپوور کراو ئێستاش دیسان ئاوەدان کراوەتەوە، دیارە زیاتر لەبەر کەم ئاوی‌و بێ دەرامەتیش نموونەم بە (خوڕخوڕە) هێناوەتەوە نەك لەبەر شتێکی دیکەو هیوادارم خزمانی عەشیرەتی (جافە ڕەشکە) بەهۆی تەفسیری دیکەوە کە مەبەستم نیە لێم زویر نەبن.

[2] شایانی باسە کە بەدرێژایی مێژوو هەر کەسێك پەنای بردبێتە بەر بیری نەتەوەپەرستی‌و ڕەگەزپەرستی بەدناو بووەو بۆتە جێی نەفرینی مێژوو، وەك هەرکام لە جەنگیزو هۆلاکۆو هیتلەرو مۆسۆلینی‌و جمال عبدالناصر و میشێل عەفلەق و صدام حسێن و هەر کەسێکی دیکەی وەك ئەوان، چ کۆن بێ چ نوێ!!

جیهان بۆتە مەیدانی کوشت و کوشتارو جەنگ و هەراو ڕاوو ڕووت و دەست درێژیو، یاسای دەریا (ماسی گەورە ئی گچکە قووت دەدات) بۆتە دەستووری ژیان و گوزەرانی گەلان.

خۆ ئەگەر بیری ناسیۆنالیزمی تاقە زیانی بۆ بەرەی ئادەمیزاد ئەوە بووبێ کە بوو بەئاگری بن کای هەڵایساندنی دوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم، هەر ئەوەندە بەسە بۆ ئیسپاتی زیانبەخش بوونی.

کەواتە: بەسە با وازبێنین لەقسەی بێ ڕێو جێو تانەو تەشەری بێ سەروپێ، سەبارەت بەکەلە مسوڵمانێکی وەك (صلاح الدين) کە بەئیسلام بوو بەو پیاوەو، بەوێو بەهاو وێنانیشی کورد ناوی بەرز بۆوەو، ناوی لەمێژووی ئیسلام و مێژووی جیهاندا بەوپەڕی ڕێزەوە تۆمار کرا، با لەجیاتی بێ ئەمەکیو سپڵەیی نواندن دەربارەی کەسێك کە تەنانەت دوژمنانیش دان بە ڕێزو گەورەیی یدا دێنن[1]، بڵێین:

---

[1] کارل برۆکلمان ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ دەربارەی (صلاح الدين) گوتوویەتی: "لەڕاستیدا (صلاح الدين) بە هۆی ئەو جەنگانەوە کە لەگەڵ خاچ پەرستەکاندا کردنی، بوو بە ناسراوترین سەرۆك لەنێو سەرۆکەکانی ڕۆژهەڵاتدا– لەکن ئەورووپاییەکان.

لەڕۆژهەڵاتیشدا ئەوە ناوی بە نەمری ماوەتەوە لە پەنا ناوی (هارون الرشيد) و (الظاهر بيبرس)دا، وەك ڕەمزو نیشانەیەك بۆ چاخێك لە بەختەوەرترین چاخەکانی مێژوو و پڕ ئاسایش ترینی.

وەگومانی تێدا نیە کە کەمێکی کەم لەسەرۆك و فەرمانڕەوایانی ئیسلام شان لەشانی دەدەن، لەبواری خۆ یەکلا کردنەوەو پاکیو بێ خەوشیدا لەهەر جۆرە بەرژەوەندییەکی کەسی، وە لەبواری لێبران و دڵسۆزییدا بۆ خزمەتی دەوڵەت و دانیشتووانی.

وەدوژمن و ناحەزانی هیچ چارەیان نەبووە بێجگە لە دان هێنان بە مەردایەتیو دڵنەرمیو بەخشندەییدا سەبارەت بەدوژمنە وەبن کەوتووەکانی.

نەك هەر ئەوەندە، وێڕای ئەمەش (صلاح الدين) پشتیوانی زانیاری بوو... وەخزمەتی (صلاح الدين) لە هونەری بینا دروستکردندا لەقودس و قاهیرەدا درەوشاوەیە... مزگەوتی (الأقصى)ی نوێ کردەوەو، قوتابخانەیەکی چوار داڵانی بۆ یەکەمین جار لە نێزیك گۆڕی ئیمامی شافیعییەوە دروست کرد.." بڕوانە: (تاريخ الشعوب الإسلامية) نووسراوی (کارل برۆکلمان)، چاپی نۆیەم، ١٩٨١، ل٣٥٨-٣٦٠.

جا خوێنەری بەڕێز سەرنج بدە! ئەمە دان پێداهێنانی کابرایەکی خاچ پەرستە کە باب و باپیرانی زەبری گرچووبڕو مەردانەی (صلاح الدين)یان زۆر پێکەوتوە کەچی جوامێریو گەورەیی (صلاح

"دەك یاخوا (صلاح الدين) بە بەهشتی بەرین شادبی، بۆ خزمەتی كردت بە ئایینی ئیسلام و گەلی كورد، چونكە تۆ سەری ئیسلامت بە كوردو ئی كوردت بەئیسلام بەرز كردەوە."

## ٥- با سەوداو بازرگانی بەئایینەوە كردن، ئایینمان لەبەرچاو نەخات!

مێژووی هیچ بیروباوەڕێك -ئایینیو غەیری ئایینی- خاڵی نەبووە لەچەند كەسێكی بازرگان و هەڵپەرست و دنیاویست لەژێر پەردەی ئەو بیرو باوەڕەدا، چونكە لەهەموو چاخ و ڕۆژگارێكدا، كەسانێكی نەفس نزم و بەرژەوند پەرست هەبوون و هەن، كە بەهەر شێوەو شێوازێك بووە نەفسی نزم وچڵێسی خۆیان لەئارەزووەكانی تێر بكەن، بەبێ ڕەچاوكردنی هیچ شتێك لە ئایین و ویژدان و ڕەوشت.

ئینجا هەڵبەتە ئایینی پاك و بێگەردی ئیسلامیش، لەم یاسایە ڕێژەبەڕ نیەو كەم و زۆر بەشی لەو جۆرە كەسە نەفس نزم و نامەردانەدا هەبووەو هەیەو دەبێت.

كەواتە: ئەگەر بێت و وا چاوەڕوانی ئیسلام بكەین كە هیچ كەس لەوانەی خۆیان بەشوێنكەوتووی دەزانن، نەتوانن لەبن پەردەی ویدا خیانەت و ناپاكی بكەن، ئەوە چاوەڕوانی شتێكی نەگونجاوو ناواقیعی دەكەین، چونكە مرۆڤ هەرچیەك بێ هەر مرۆڤەو هەڵەو تاوان و ناپاكیو هەموو شتێكی چاك و خراپی لێ چاوەڕوان دەكرێو نابێتە فریشتە.

جا خوێنەری بەڕێز!

مادام وابێ ئەگەر مەلایەك یان شێخێك یان خوێندەوارێك یان نەخوێندەوارێكت دیو بەناوی ئیسلامەوەو لەژێر پەردەی ئیسلامدا ناپاكی لێ پشكووتەوە، ئەوە بەشتێكی زۆر ئاسایی تەماشای بكەو سەرت سووڕ نەمێنێو هێندەی نووكە دەرزیەك بڕوات بەرامبەر بەئیسلام كەم نەكات و نە لەخشێی!؛ ئایا هیچ كەست دیوە بەهۆی ڕەفتاری نالەبارو خێچ و خواری كۆلكە پزیشكێكی ناشێی هەڵپەرست زانیاری پزیشكی گەری (الطبابة)ی لەبەرچاو كەوتبی؟!

بێگومان نە، وە ئەگەر كەسێكی واش هەبێ بەهەڵەدا چووە.

---

الدين) ناچاری دەكات ئاوا مەدحی بكات وپێی هەڵا بڵێو گوتراویشە: (والفضل ماشهدت به الأعداء) بەڵام زۆرە مسوڵمان و فەریكە كوردی وامان هەیە بەناهەق هێرش دەكاتە سەر ئەو كەڵە پیاوەو قسەی بێ جێی پێ دەڵێ!!

بەڵێ! باجوکمێك كە بەناو مسوڵمانێکی کەچ ڕۆو بێ خێرو بێ هۆش و گۆش و دڵنەخۆش و دین فرۆش دەگرێتەوە، بەسەر ئەو ئیسلامە پاك و بێ گەردە سەربەرزەشی دانەدەین کە بابای کەچ ڕۆ بە ناهەق خۆی پێ هەڵواسیوە.

ئینجا با سووراو سووریش بزانین، کە لەهیچ چاخێکدا ئوممەتی ئیسلامی خاڵی نابێ لەکۆمەڵێك مسوڵمانی زاناو ڕاست و هەق گۆو مەردو بەجەرگ، کە لەکاتی گوتن و ڕاگەیاندنی هەقی'دا شەرمێ لەشای ناکەن و بەرنامەی خوا چۆنە ئاوای بەخەڵکی ڕادەگەیەنن، بێ ئەوەی تەماع و ترس هێندەی پووشکەیەك کاریان تێ بکاو ڕێڕەویان پێ بگۆڕێ یان خوار بکات.

## گەواتە بەکورتی:

هیچ کەس بۆی نیە قسەو کردەوەو ئاکارێ مرۆڤی بەناو مسوڵمانی بێ بەندو باری نالەباری بەسەر ئیسلامەوە بار، بکاتە بیانوو و بەهانەی گلەیی‌و گازاندە کردنی پشت پەل بوونی‌و ڕاکردنی لەئیسلام.

قسەشم لەگەڵ ئەو بازرگانانەدا ئەمەیە:

هۆ ئایین فرۆشە ترسنۆکە بەزیوەکان!

بۆچی خۆتان کردۆتە بڵیندگۆ (مکبرة)ی ستەمکاران؟!

ئەگەر هاندەری خۆ دەرخستن (حب الظهور) پاڵتان پێوە دەنێ ئەو کارە بکەن، ئەوە زۆر چاك بزانن بەمەڵەداچوون و سەرەڕای سووکی‌و بێ سەنگی گێل و نەفامیش دەرچوون!

چونکە هەر کەسێك بازرگانی بەبەرنامەی خواوە بکات، خوا لەهەقی خۆی خۆش نابێ‌و ڕیسواو زەبوون و ڕووڕەش و شەرمەزاری دنیاو دواڕۆژی دەکات.

وە ئەگەر هاندەری ئایین فرۆشیشتان وەدەست هێنانی بەرژەوەندی‌یەکی دنیایی‌یە، وەك زۆر چەورکردن و ئافەرینێك، ئەوە زۆر باش بزانن کە زیانبارترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە ئایینی خۆی بەدنیای خەڵکی دەفرۆشێ، جا ئەو کرێ‌یەی وەری دەگرێ هەرچی‌یەك بێت!

وە ئەگەر ترسانیش واتان لێ دەکات خۆتان ڕیسوای لای خواو خەڵکی بکەن، ئەوە باش گوێتان لێ بێ‌و بزانن کەئایەتی: ﴿الا في الفتنَةِ سَقَطُوا﴾تان بەسەردا چەسپیوە، چونکە ئێوە

جوولەکە سفەتی زراو ڕژاوی بەزیوی تۆقیو! لەزیانێکی[1] دووری ئیحتمالی ڕادەکەن و تووشی گەورەترین زیانی واقیعیو حەتمی دەبن!!

وە بشزانن تەمەنی ئینسان نە بەئازایەتی کورت دەبێو نە بەترسنۆکیش درێژدەبێ.

هیواداریشم چیدی لەسەر ئەو ڕێچە چەوت و خوارەتان نەڕۆن و بەرەو باوەشی گەرمی قورئان و سوننەت و ژێر سێبەرو پەنای خواو، ژێر ئاڵای عیززەت و مەردایەتیو جیهاد بگەڕێنەوەو، لەوەی تا ئێستاش کردووتانە تۆبەیەکی چاك بکەن و پەشێمان ببنەوە، بەرلەوەی بەناچاری پەنجەی پەشێمانی بگەزن و، لەشەرمەزاریو ڕوو ڕەشیو لەحەژمەتان لەبەردەم دادگای بەسام و هەیبەتی خوادا بتەزن!!

## ٦- مەسەلەی کورد چی‌یەو، چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ؟!

گەلی کورد یەکێکە لەو گەلە سەرەکی‌یانەی بەهەموویان ئوممەتی ئیسلامی پێك دێنن، ماوەیەکی زۆرە لەبن باری ستەم و چەوساندنەوەو دەستدرێژی کرانەسەردا دەناڵێنێ، وە لەڕاستی‌دا ستەمدیدەیی‌و چەوساوەیی‌و بێ قەوارەیی نەتەوەی کورد لەئاڵۆزترین و گرنگترین مەسەلەی جیهان بەگشتی‌و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەتایبەتی دادەنرێ!

جا ئایا حەقیقەت و نێوەرۆکی ئەو مەسەلە گرنگە چی‌یەو چۆن و بەچیش چارەسەر دەکرێ؟!

خوا پشتیوان بێ لەم باسەدا هەوڵ دەدەین وەڵامێکی ئیسلامی‌یانەی ڕاست ودروستی هەرکام لەم سێ پرسیارە بدەینەوە:

### یەکەم: مەسەلەی کورد چی‌یە؟!

پێشەکی دەڵێین:

هەتا مسوڵمانانی جیهانی ئیسلامی بە تێکڕایی پابەندی ئیسلام بوون و درووشم و ئاڵای ئیسلامی‌یان هەڵگرتبوو، کێشەیەك بەناوی (کێشەی کورد) لەنێشتیمانی ئیسلامی‌دا نەبوو، بەڵکو کوردو عارەب و تورك و فارس و باقی نەتەوەکانی دیکە، بە برایەتی‌و تەبایی پێکەوە

---

[1] لێردا بەگوێرەی تێگەیشتنی وان قسەم لەگەڵ کردوون، چونکە ئەوان پێیان وایە هەرچی لەڕێی خوادا بڕوات یان بگیرێ ئەوا خۆی بەهیلاك داوە!! دەنا لەڕاستی‌دا ئازار دیتن و کوژران لەپێناوی ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوادا گەورەترین پلەی مسوڵمانەتی‌یە، واتە شەهید بوون یان بەرەو شەهیدی چوون.

دەژیان و، بە هەموویان خزمەتی ئیسلامیان دەکرد، وە هەروەك چۆن عارەبێك و تورکێك ماف بیروڕا دەربڕین و کاروبار هەڵسووڕاندنیان هەبوو، کوردیش بەهەمان شێوەو بێ جیاوازی، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەم قسەیەمان، ئەوەیە کە جیهانی ئیسلامی لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا بەتورك و عارەب و نەتەوەکانی دیکەشەوە، بەسەر کردایەتی کوردی مەرد سوڵتان (صلاح الدین)ی ئەییوبی ڕازی بوون، کە سەرۆکایەتی بەهێزترین و گەورەترن دەوڵەتی ئیسلامی ئەو کاتەو سەرکردایەتی سوپای ئیسلام بکات و، سەری ئیسلام بە کوردو ئی کورد بە ئیسلام بەرز بکاتەوەو، پاشەکشە بەسوپاو قۆشەنی خاچ پەرستان بکات و ڕووی جیهانی ئیسلامی سپی بکاتەوەو قودسی پیرۆز لە چەنگاڵی پیسی ئەورووپییە خاچ پەرستەکان ڕزگار بکات!

دیارە ئەو سەردەمە گەلی (کورد) وەك هەر ئەندامێکی دیکەی ئەو ئوممەتە ئیسلامییە ماف تەواوی پارێزراو بووە، دەنا ئەوەتا ئیستاش کورد هەر هەن و گەلێك لەجاران پتریشن، بەلاَم نەك هەر ڕێگای بوونە سەرقافڵەو برا گەورەیەتییان نیە، بگرە سادەترین مافی سرووشتیو ئینسانیشی پێ ڕەوا نابینن کە بریتییە لە ژیان و گوزەران لەخاك و ئاوی خوا پێداوی خۆیدا!

لەمەوە گەیشتینە ڕاستییەکی گرنگ کە وەلاَمی پرسیاری (مەسەلەی کورد چییە؟)شە!

ڕاستییەکەش ئەوەیە کەداوی سست بوونی پەیوەندی برایەتی ئیسلامیو بلاَوبوونەوەی گەرای پیسی (ناسیۆنالیزم)و ڕەگەزپەرستی (العنصریة) لەنێو جیهانی ئیسلامیدا، گەلە ئیسلامییەکان بەگشتیو تورك و عارەب و فارس بەتایبەتی برایەتی ئیسلامییان پێکەوە پچڕاندو بەپیلان و نەخشەی گلاَوی هێزە زلە ستەمکارو بێ ویژدان و خوانەناسەکان کەوتنە نێو تەڵەو داوی سیاسەتی پەرتکەو زاڵبە (فرق تسُد)ی ئیمپریالیزمەوەو، عارەب ئالاَی عارەبایەتیو تورك ئی تورکایەتیو فارس ئی فارسایەتییان هەڵگرت و، بەلاسا کردنەوەی کوێرانەی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر کەوتنە داپلۆسین و چەپۆك پێدادانی گەلی بێکەس ودڵ سافی کوردی دراوسێیان[1]، دیارە لەحاڵێکی واشدا گەلی کوردیش بەپێی یاسای سرووشتی

---

(1) **لاباسیکی گرنگ**

**دەربارەی چۆنیەتی زەوت کران و دابەش کردنی کوردستان**

هەر لە سەرەتای سەدەکانی نێوەڕاستەوە کوردستان لەنێوان دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیدا دابەش کرا، لەسەدەی شازدەیەمەوە سوڵتان سەلیمی عوسمانی بەشی ڕۆژئاوای کوردستان و، شا ئیسماعیلی سەفەوی بەشی ڕۆژهەلاَتیان بۆخۆ دابڕی! ⇦⇦

پاشان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە لەئەنجامی کزیو بێ هێزی دەوڵەتی عەسمانی‌یەوە بەشێك لەخاکی کوردستان کەوتە ژێر دەستی ڕووسیا، ئینجا لەپاش جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨)ە وە کوردستان بەم شێوەیەی ئێستای بەسەر ئێران و عێراق و تورکیاو سووریادا دابەش کرا، وەك خاوەنی ئەسڵی کوردستان فارس و عارەب و تورك بن و (کورد) هیچ هەقێکی پێیەوە نەبێ!!

ئەمەی ڕابرد کورتەی هەواڵی چۆنیەتی دابەشکرانی کوردستان بوو، ئەم جار با نۆرەی درێژەی ئەو هەواڵە تاڵ و جەرگ بڕو نائیسلامیو بێ ویژدانانەیە بێت:

... گەورەترین هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم بریتی بوو لە تەماعکارییو چاوچنۆکی دەوڵەتە زلەکان بۆ بەسەر خۆدا دابەشکردنی جیهان!

تێکڕای ئەودەوڵەتە زلانەش وەك کتکی برسی چاویان دەخاکی دەوڵەتی عوسمانی بڕیبوو و بەپەرۆشەوە چاوەڕێی میراتەکەی بوون!

تەنانەت ئەڵمانیای هاوپەیمان (حليف)ی تورکیاش لەدەوڵەتە زلە هاوپەیمانەکان کەمتر بەهیوای میراتی هاوپەیمانەکەی نەبوو!

لەبەر ئەوە هێزە زلەکان بەجیاجیاو بەکۆمەڵ مقۆمقۆیان بوو و سەرگەرمی دانانی نەخشەو پیلانێك بوون بۆ مێنانەدی ئەو ئامانجەیان کەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگ بوو.

جا بێگومان کوردستانیش وەك بەشێك لەو میراتەو پارچەیەك لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی، شوێنێکی بەرچاوی هەبوولەو نەخشەو پیلانە گلاّوەدا.

ئینجا پاش مشت ومڕو بگرەو بەردەیەکی زۆر دەوڵەتە هاوپەیمانەکان (الحلفاء) بەشێوەیەکی نهێنی لەسەر دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی، کە ئەو کاتە ناویان لێ نابوو پیاوە نەخۆشەکە (الرجل المريض)، ڕێك کەوتن، دیارە ئەو ڕێك کەوتنەش نەك هەر بەبێ ئاگاداری گەلانی ئەو ناوچانە بوو، بەڵکو لەسەر حیسابی دواڕۆژیشیان بوو!

ئەو ڕێك کەوتن و پەیمانەی دەوڵەتە زلەکانیش کە لەمێژوودا بەپەیمانی (سایکس پیکۆ) ناسراوە، بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی:

سەرەتا لەڕۆژی (١٩)ی مارتی ساڵی (١٩١٦)دا لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسادا گفت و گۆ دەستی پێ کرد، نوێنەری بەریتانیا (مارك سایکس)و نوێنەری فەرەنسا (جۆرج پیکۆ) بوو، پاشان هەموو ئەنجامەکانی گفت و گۆی بەریتانیاو فەرەنسا خرانە بەرچاوی ڕووسیا.

ڕووسیاش دوای بێنەوبەرەو مشت و مڕێکی زۆر قایل بوو کە پەیمانی گۆڕین مۆر بکات.

دوایی لە ڕۆژی (٢٦)ی نیسانی ساڵی (١٩١٦)دا فەرەنساو ڕووسیا ڕێك کەوتنێکی تایبەتی‌یان لەبارەی دابەشکردنی ناوچە ئاسیایی‌یەکانی دەوڵەتی عوسمانی مۆرکرد.

دوای ماوەیەکی کەم بەریتانیاش ڕەزامەندی خۆی بەرانبەر بەو ڕێك کەوتنەی هاوپەیمانەکانی پێشان دا.

(لەسەرخۆ کردنەوە) کەوتە جم و جۆڵ و پەلەقاژە بۆ وەدەست هێنانی ئازادیو سەربەخۆیی، بەڵکو بگرە بەس بۆ خۆ دەربازکردن لە لەنێو چوون و توانەوە!!

---

... لەڕۆژانی (٩)و (١٦)ی مایسی هەمان ساڵدا ڕێك كەوتنێكی دیکەی لەو جۆرە لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساشدا مۆرکراو، بەم جۆرە پەیمانی گڵاوی نهێنی (سایکس پیکۆ) لەدایك بوو، بەڵام بە زۆڵی!!

سەرەنجام بەرهەمی جەنگی یەکەمی جیهانی شوومی نێوان دەوڵەتە زلەکان ئەوە بوو کە میراتی پان و بەرینی دەوڵەتی عوسمانیو بەناو خەلافەتی ئیسلامی!! لەنێوان ڕووسیاو بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیادا بەشرایەوەو، کوردستانیش کە بەشێکی ئەو میراتە بەلاشە بوو ئاوا کرا بەخێرو خێرات و لەسەر سفرەو خوانی دەوڵەتە زلە پێشکەوتووخوازەکان! دابەش کرا:

بەشی ڕۆژهەڵاتی لە چوارچێوەی ئێراندا مایەوە، بەشەکەی دیکەشی کرایە دوو لەت، کوردستانی سەروو پاش سەرکەوتنی کەمالیەکان لەنێو دەوڵەتی نوێی تورکیادا مایەوە، کوردستانی خوارووش پاش بێنەو بەرەیەکی زۆر خرایە سەر عێراق و عێراقیش کەوتە ژێر ڕکێفی ئینگلیزەوە.

هەڵبەتە پاش ئەو کەین و بەینە لەساڵی (١٩٢٠)یشدا پەیمانی (سیڤەر) بەئامادەبوونی دەستەیەك لە نوێنەرانی کورد بەسترا، لەبەشی سێیەمی لەماددەی (٦٢ و٦٤)دا بنیات نانی کوردستانێکی سەربەخۆی پێشنیار کردو، دیارە گەلی کورد زۆریان دڵ پێ خۆش کرد!

بەڵام پاش کودەتا (انقلاب)ی کەمال ئەتاتورکی دژ بەئیسلام و نەتەوەپەرست، لەساڵی (١٩٢٣)دا پەیمانی (لۆزان) بەستراو هەموو ئەو بڕیارانەی کە لەپەیمانی سیڤەردا درابوو هەڵوەشێنرانەوە!

سەرەنجام وەك پێشتر گوتمان (کوردستان) ئەو سەرزەمینە فراوان و پێکەوە جۆشدراوو ئاڵقەبەندکراوەی کە لە دەریای ڕەشەوە هەتا کەنداو (خلیج) درێژ دەبێتەوەو، یەك گەلی یەك ڕەگەزی (بێ شوانی) تێدا دەژی ئاوا دابەش کرا:

(٢٢٠٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بەتورکیا و (١٩٠٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بەئێران و (١٠٥٠٠٠) کیلۆمەتری دووجای درا بەعێراق!!

(٢٩٪)ی خاکی تورکیا موڵکی کوردەو (١٢٪)ی خاکی ئێران موڵکی کوردەو، (٢٩٪)ی خاکی عێراقیش موڵکی کوردە!

شایەنی باسیشە کە هەرکام لەڕووسیاو سووریاش ئەندازەیەکیان لە خاکی کورد بۆخۆ دابڕیوە بەڵام: ﴿وَسَيَعلَمُ الذين ظَلَموا اي مُنقَلَبٍ يَنقَلِبون﴾ الشعراء (٢٢٧).

تێبینی: بۆ نووسینی ئەم لاباسە پشتم بەم سەرچاوانە بەستوە:

١- (کورد و کوردستان) واسیلی نیکیتین، وەرگێڕ محمد قاضي، ل٦٢٣-٦٢٥.

٢- (کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی دا) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ل١٥٧-١٦٩.

٣- (خەبات لەڕێی کوردستان دا) نووسینی: ن. ا. خەلفین، وەرگێڕ: جەلال تەقی، ل٥-١٥.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

پێویستە ئاگاداری ئەومەسەلەیە بین کە باسکرانی کوردایەتی لەلایەن بابای کوردی پلیشاوەوە فەرقی یەکجار زۆرە لە باسکرانی عارەبایەتی‌و تورکیایەتی‌و فارسایەتی‌و... چی‌و چی‌یایەتی لەلایەن ئەو گەلانەوە کە خاوەنی دەوڵەت و کیان و قەوارەی خۆیانن!

چونکە کورد کە دەڵێ کوردم و باسی کوردو کوردستانی دەکات مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ:

باوەك چۆن خەڵك هەیە منیش هەبم و نەپلیشێمەوەو لەبەین نەچم!!

بەڵام بابای تورك کە لاف تورکایەتی لێ دەدا مەبەستی ئەوەیە کە بەس بۆ خۆی هەبی‌و کوردە دراوسێ‌یەکانیشی بە تورکی شاخاوی لەقەڵەم بدات! هەروەها عارەب و فارسیش و هەر گەل و نەتەوەیەکی خاوەن دەوڵەت و قەوارەو دەسەڵاتی دیکەش!!

جا بێگومان قسەی دوو کەس کە یەکیان دەڵێ: با منیش هەبم! وە ئەوەی دیکەیان دەڵێ: بابەس من هەبم و خەڵکی دیکە بەردەست وخزمەتکارو کۆیلەی من بێ، هێندەی ئاسمان و زەوی لێك دوورن.

ئەم ڕاستی‌یەشم بۆیە خستەڕوو تاکو لەناسینی واقیعی گەلەکەمان و تێگەیشتنی بارودۆخی نەفسی و سیاسی‌دا بەهەڵەدا نەچین و، لەڕوانگەو گۆشەنیگای خەڵکی دیکەوە نەڕوانینە ئەو گەلە چەوساوەو بەشخوراوەو، خۆمان لە ئاوێنەی تێڕوانین و بیرکردنەوەی خەڵکی دیکەدا نەبینین، چونکە حەیفێ گەلێك برا مسوڵمانمان هەن ئاوا ڕەفتار دەکەن!!

بەڵێ! بەگوێرەی یاسای فیزیایی: بۆ هەموو کارێك کاردانەوەیەك هەیە، لە ئەندازەدا بارتەقایەتی‌و لەئاڕاستەدا پێچەوانەیەتی (لکل فعل رد فعل یساویه في المقدار ویعاکسه في الإتجاه)، گەلی کوردی بێ بەش و ستەمدیدەو لەت و پەت کراوو نیشتیمان زەوت کراویش، ئاڵای کوردایەتی هەڵگرت و، بەمەشەوە نەوەستاو پەنای بردە بەر چەندان ڕێچکەو بیردۆزەی جۆراو جۆری ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاوایی، بەشکم ئەوە خوایە دەفریای بێن و بە ئامانجی بگەیەنن و، لەستەم و چەوساندنەوەو بێ قەوارەیی قورتاری بکەن! بەڵام هەیهوو هەیهوو!!

**کەواتە:**

پوختەی مەبەست ئەوەیە کە کێشەو گیروگرفتی کورد بریتی‌یە لە ستەم لێکرانی‌و نیشتیمان زەت کرانی‌و ماف ڕەوای پێ شێل کرانی لەلایەن دەرو دراوسێ‌کانیەوە، ڕوونتر بڵێم:

کاکڵی کێشەی کورد بریتی‌یە لە (ماڤی ژیان پێ ڕەوا نەدیتران)ی لەلایەن دراوسێ‌و برا مسوڵمانەکانی‌یەوە[1]!

خوێنەری بەڕێز!

ئێستا کە زانیمان کێشەو گیروگرفتی گەلی کورد چی‌یەو چۆن پەیدا بووە؟ باپچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری دووەم:

## دووەم: مەسەلەی کورد چۆن چارەسەر دەکرێ؟!

چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەوە دەبێ کە کوردیش وەك هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەی جیهان گەلێکی ئازادو سەربەخۆ بێ‌و، لە نیشتیمانی خۆیدا ئازاد بێ‌و هیچ کەس بە هیچ ناوو نیشانێکەوە ئاغایەتی‌و کوێخایەتی بەسەردا نەکات و مافە سرووشتی‌یە ڕەوایەکانی خۆی لێ زەوت نەکات!

کەواتە: هەتا گەلی کوردی مسوڵمان پچەوسێنرێتەوەو، دراوسێ‌یەکانی بە کەمایەتی (اقلیة)و مسکێن و ژێردەستە سەیری بکەن و، هەتا نیشتیمانی کورد پارچە پارچە بێ‌و لەبازاڕی ڕەشی ئیمپریالیزمی جیهانخۆردا سەوداو مامڵەتی پێوە بکرێ‌و بەملاو ئەولا بفرۆشرێ، وە هەتا ماڤ قەوارە هەبوون و دەوڵەت هەبوون وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا بەکورد ڕوا نەدیترێ‌و، هەتا کورد وەك منداڵی زڕ هەرجارە لەلایەن دراوسێ‌یەکەوە چەپۆکی بێ ڕەحمانەی پێ دابدرێ‌و دابپەڵۆسرێ! مانای وایە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە کێشەو گیروگرفتی کورد هەر بەردەوامەو لەئارادایەو، بۆ گەلی کورد مافێکی یەکجار سرووشتی‌و ڕەوایە کە هەرچی توانای هەیە بیانخاتە کار، بۆ بوونی خۆسەلماندن و خۆ قوتار کردن لەژێر چەپۆکی‌و چەوساوەیی‌و، وەدەست هێنانی ئازادی‌و سەربەخۆیی ڕەواو شەرعی!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

با تۆش و هەموو کەسێکی دیکەش بزانێ کە ئێمەی (ئیسلامی)و شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بێ پێچ و پەناو بەڕاشکاوی دەڵێین:

---

[1] هەڵبەتە لەم قسانەمدا ڕووی ڕەخنەو گلەییم لەدەسەڵاتدارو ڕێشەمە بەدەستانی ئەو گەلە دراوسێ‌یانەیە نەك خەڵکە بێ چارەکە.

چارەسەری مەسەلەی کورد لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوەیە کە کوردیش مادام وەك هەموو گەلانی دیکەی دنیا خاوەنی زمان و ئیشتیمانی تایبەتیو سەربەخۆی خۆیەتی، بەهیچ ڕەنگێك ڕەواو شەرعی نیە بکرێتە پاشکۆی گەلێکی دیکە، یان هاو وڵاتی‌یەکی پلە دوو!!

چونکە چەندە عارەب عارەبەو تورك تورکەو ئینگلیز ئینگلیزە، هێندەش بێ کەم و زیاد کورد کوردە[1] !

واتە نەتەوەی کوردیش لەنەتەوە (شعب) بوون دا هیچی لە نەتەوەکانی دیکە کەمتر نیە، دەی بۆچی دەبێ شتێك کە بەنەتەوەکانی دیکە ڕەوا بینراوە بەمنیش ڕەوا نەبینرێ؟!

بەڵام خوێنەری سەنگین!

با تۆش و هەموو کەسێکی دیکەش بزانن! کەئێمە بەهیچ جۆرێك مەبەستمان لەخستنە ڕووی ئەم ڕاستی‌یە ئەوە نیە، کە ئوممەتی ئیسلامی بەبیانووی سەربەخۆیی نەتەوەکانەوە لەت و پەت بکەین!! (هەر چەندە لەت و پەتیش کراوە)!!

ئینجا دابینکردنی ماف گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەش بەشێوەکی ئیسلامی بەهیچ شێوەیەك سەرناکێشی بۆ لەت و پەت کردنی ئیشتیمانی ئیسلامیو پەرتەوازەبوونی ئوممەتی پێغەمبەرﷺ، چونکە ئەو ماف دابینکردن و ئازادیو سەرخۆیی وەدەست هێنانە لەڕوانگەی

---

[1] چەند جارێك لەگەڵ برا ئیسلامی‌یە عارەبەکان بۆتە کێشەو مشت ومڕی توندمان لەسەر پێ داگرتن و جەخت کردنی ئەوان لەسەر ئەوە کە هەر قسەیەکی کورد لەسەر کوردایەتیو باسی ماف و قەوارەی نەتەوەیی، ئەوە بەدژایەتی عارەب تەواو دەبیو ئیسلامیش پیی ڕازی نیە!! ئێمەش پێمان گوتوون: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی (لایؤمن احَدُکُم حَتی یُحِب لاَخیهِ مایُحِب لِنَفسِهِ) رواه مسلم، جا ئەگەر کیان و دەوڵەت هەبوونتان بۆ خۆتان پێ باشە، بۆ ئێمەشتان پێ باش بێ! بۆچی ئێوە (٢٠) دەوڵەتتان پتر هەبێ بەڵام برا کوردەکانتان یەکێکیان نەبێ؟! ئەگەر پێشتان باش نیەو دەڵێن ئێمەی عارەبیش ئەم واقیعە سیاسی‌یەمان بەزۆر بەسەردا سەپێنراوەو بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ وامان لێ کراوە! دەڵێین: دەباشە مادام وایە ئەو سنوورە جوگرافیو سیاسی‌یانەی ئیمپریالیزم بەشتێکی پیرۆز (مقدس) مەزانن و پێتان وانەبێ بەتێکدانیان (کابە) کەچ دەبیو، وەرن باپێکەوە خەبات بکەین بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەخشە سیاسیو پیلانە زاڵمانەیەی ئیمپریالیزم کە جیهانی ئیسلامی بەش بەش کردوە!

ئیسلامەوە بەدوو شێوە مومکین دەبێ[1] ، کە هیچ کامیان زیان بە یەکیەتی جیهانی ئیسلامیو ئۆممەتی ئیسلامی ناگەیەنن:

١- ئەگەر بگونجێ دەوڵەتێکی بەرفراوانی ئیسلامی لەسەر ئاستی ئۆممەتی ئیسلامیو نیشتیمانی ئیسلامی پێك بێ، گەلی کورد بەشێکی ئەو ئۆممەتەو نیشتیمانەکەشی ناوچەیەك و ویلایەتێك بێ لەو نیشتیمانە فراوانە.

٢- ئەگەر پێکهاتنی دەوڵەتی فراونی ئیسلامی مومکین نەبوو، ئەوا هەروەك چۆن عارەبستان و تورکستان ئەفغانستان و هیندستان... هەن، با (کوردستان)یش هەبێو، ئاڵای ئیسلامی لەسەر بشەکێتەوە[2] .

ئینجا بابچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیاری سێیەم و کۆتایی:

## سێیەم: مەسەلەی کورد بەچی چارەسەر دەگرێ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

لەڕوانگەی ئێمەی ئیسلامیو پابەندی ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ تاقە ڕێگەی بەئامانج گەیشتن و تاقەدەرمان و چارەسەری هەموو دەردو گیروگرفتێك تەنهاو تەنها بەرنامەی خواو ڕێو شوێنی (محمد المصطفی)یە ﷺ.

---

[1] دیارە ئێمە بڕوامان وایە کە چارەسەری شەعیو ڕاستەقینەی کێشەی کورد دەبێ بەیەکێك لەم دوو شێوەیە بێ، بەڵام وێڕای ئەمەش بڕوامان بەپلە پلەیی (تدرج)یش هەیەو، مەرج نیە ئینسان بتوانێ یەك تەکان بەیەك قۆناغ بە ئامانج بگات، کەواتە هەر هەنگاوێك کە لە ئامانجمان نزیك دەکاتەوە بەشتێکی پەسندو چاکی دەزانین کرنگ ئەوەیە ئێمە هەقە شەرعیەکەو چارەسەرە ڕاستەقینەییەکەمان هەر لەبەر چاو بێو لەبیرمان نەچێتەوە.

[2] بێگومان کوردستان لەسەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا چ ماوەی چوار جێنشینەکان و چ ئەمەوییەکان و چ عەبباسیەکان و چ عوسمانییەکاندا، لەت و پەت نەکرابوو و کوردیش بەش بەش نەبوو بوو بەڵکو نیشتیمانی کورد دوای لێشاوی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاواو هێرش هێنانی بۆسەر جیهانی ئیسلامیو بەتاییەتی دوای دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەسەر دەوڵەتە زلەکاندا، پارچە پارچە کراو بەشرایەوە، وەك پێشتر باس کرا، بڕوانە کتێبی (کیف هدمت الخلافة)ی عبدالقدیم زلوم، ل٩٨.

بەڵێ! ئێمە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرﷺەوە نەك تەنها بەئامانجی ڕزگاریی و سەربەخۆیی دەگەین، بەڵكو هەموو ئاوات و ئامانجێكی بەرزو پیرۆزی ماددیی و مەعنەویی دنیاو دواڕۆژان وەدەست دێنین، چونكە ڕزگاربوون و بەمراد گەیشتنی گەلی چەوساوەی كوردو هەر گەلێكی دیكەی وەك ویش پەكی لەسەر سێ مەرجی سەرەكی كەوتوە، وە بەهۆی گرتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە هەرسێكیان دێتەدی:

١- تێكۆشان (الجهاد).

٢- لەسەرلاقی خۆ وەستان (الاعتماد على الذات).

٣- یەكریزیی و كۆڵ نەدان (وحدة الصف والثبات).

بەڵێ ئیسلام وا لەشوێنكەوتوانی دەكات، كەژیان و مردن ومان و نەمانیان لەپێناوی خوادا بێت و لەپێناوی چەسپاندنی حوكمی خوادا هەموو شتێك بەخت دەكات.

وە وایان لێ دەكات كە بەهۆی پشت بەخوا بەستن (التوكل على الله)ەوە یەكجار پشت ئەستوور بن و زۆر متمانە بەخۆیان بكەن و خۆیان بەحەوجەیی سواڵ وسەدەقەی ئەملاو ئەولا نەزانن!

وە وایان لێ دەكات كە دڵیان پێكەوە گرێ بدرێ و وەك چینی دیوارێكی پێكەوە جۆش دراوو مەحكەم یەكدی ڕاگیر بكەن وپشتی یەكدی بگرن، وەهەتا دوا هەناسەی ژیانیان درێژە بەخەباتیان بدەن و خەبات و قوربانیدانەكەشیان بە گەورەترین جۆری عیبادەت لەقەڵەم بدەن.

## ٧- ڕەواندنەوەی تەم ومژی بۆچوونێكی هەڵە:

هەندێ كەس هەر كەباسی ئیسلامت بۆ كردن دەڵێن:

كاكاگیان!

مەسەلەی ئێمەی كورد مەسەلەی ئایینیی و ئیسلامەتی نیە، چونكە ئێمە لەڕووی ئیسلامەتی‌یەوە ناچەوسێینەوە، بەڵكو لەڕووی نەتەوایەتی‌یەوە دەچەوسێینەوە، بەواتایەكی دیكە:

ئێمە وەك كوردێك دەچەوسێنرێینەوە، نەك وەك مسوڵمانێك، كەواتە دەبێ شۆڕش وخەباتەكەمان لەسەر بنچینەی (كوردایەتی) بێ نەك (ئیسلامەتی)!!

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین:

١- لەڕاستی‌دا ئەم قسانە زادەو هەڵقوڵاوی عەقڵی کەسێکن کە لەئیسلام حاڵی نەبووەو، پێی وایە کە مسوڵمانەتی بەس بریتی‌یە لە بەڕێوەبردنی چەند درووشمێکی مەعنەوی‌و چەند هەڵس و کەوتێکی شەخسی!! دەنا دەبوو زانیبای کە چەوساندنەوەی تەنانەت تاقە ئینسانێك نەك نەتەوەیەك! کارێکی بێ شەرعی‌و نائیسلامی‌یەو دەبێ مسوڵمانان دژی بوەستن چونکە دژی‌یەتی.

٢- لەڕوانگەی ئیسلامەوە هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەدا کە نەیەڵن بابایەکی کورد نوێژێ بکات، یان نەیەڵن لەخاکی خۆی‌دا بە ئازادی بژی‌و بەرگ و پۆشاکی خۆی دەبەر بکات و بەزمانی خۆی بدوێ، چونکە هەروەك چۆن نوێژ کردن فەرمانی خوای لەسەرە، ئازادی‌و سەربەخۆیی هەر ئینسانێك و هەر گەلێکیش فەرمانی خوای لە سەرە!

خوداش لە قورئانی‌دا قوتاربوون لەدەرووی سەختی قیامەتی‌ی بەچەند شتێکەوە بەستۆتەوە کە یەکەمیان ئازاد کردنی ئیغسانێکە چ جای گەلێك! لەژێر نیری کۆیلایەتی ﴿فلا اقتَحَمَ العَقَبَةَ. وما أدراك ما العَقَبَةَ؟ فَك رَقَبة. او إطعامٌ في يوم ذي مسغبة...﴾ البلد (١١-١٤).

٣- ئەگەر سەرنجی مێژووی ئەو گەلانە بدەین کە درووشمی نەتەوەپەرستی‌یان بەرز کردۆتەوە، دەبینین یان بە ئامانج نەگەیشتوون -بۆ وێنە عارەب و کێشەی فەلەستین-، یان ئەگەر بەڕواڵەت بەئامانجیش گەیبن بوو ونە میکرۆبێکی پیس لە ناوچەکەدا، وەك تورکە کەمالی‌یەکان [1] و عارەبە بەعسی‌یەکان.

٤- وادیارە ئەو برادەرانە بەهەڵە وا حاڵی بوونە کە مسوڵمانەتی‌و کوردایەتی دوو شتی پێکەوە دژن و قەت ناگونجێ پێکەوە کۆببنەوە! بێ‌خەبەر لەوەی کە -وەك لەڕابردوو ڕوونمان کردەوە- بابای کوردی مسوڵمانی چەوساوەو ماف زەوت کراو، ئیسلام نەك هەر ڕێگای دەدات بەڵکو فەرمانی پێ دەکات و لەسەری فەرز دەکات کە خەبات بکات دژی ئەوانەی زوڵم و ستەمی لێ‌دەکەن، وەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی (من قُتِلَ دون مَظلَمَتِهِ فَهُوَ شَهيدٌ) رواه أبوداود، واتە: (هەر کەسێك لەکاتی بەرگری کردن لەخۆی‌دا -بە هۆی زۆر لێ‌کرانەوە- بکوژرێ ئەوە شەهیدە)، دیارە کوردایەتی‌یەکیش لەسەر بناغەی ئیسلام بنیات بنرێ دامەزراوو عاقیبەت خێرەدەبێ!

---

[1] بۆ ئەوەی بزانی بیری ناسیۆنالیزمی تورکی کە لە کەمال ئەتاتۆرك و دەستەو دایەرەکەی‌دا خۆی دەنواند، چی بەسەر گەلی کوردمان هێناوە بڕوانە کتێبی: (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد) نووسینی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ل٦٧-٨٨.

دیارە ڕەفتاری بەعسی‌یەکانیش هێندە زەقە حەوجێ‌ی بەباس کردن نیە، هەرچەندە ئێمە لە پێناسەی حیزبی بەعس دا تۆزێکمان باس کردووە.

## خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشی چوارەمە وەك لەپێ خۆشكردنیش دا گوتوومە لەم چاپی دووەمەدا زیاد كراوە، چونكە وەك سەرنجم دا باس و بابەتەكانی بەشەكانی دیكە لەبارودۆخێكی دیكەداو بەشێوازێكی‌تر نووسرابوون و هەرچەندە هێشتنەوەیانم بە پێویست زانی، بەڵام پێم وایە پڕ بەپێستی واقیع و بارودۆخی ئێستامان نین، جا بۆ پڕكردنەوەی ئەو كەلێن و بۆشایی‌یەی كە بەدیم دەكرد، لەژێر ناونیشانی (مسوڵمانەتی‌و كوردایەتی...)دا یازدە (١١) كورتە باسم نووسین، كە بێگومان لەهەندێك كاردانەوە بۆ ڕووداوو هەڵوێست و كارەساتەكانی ئەم بارودۆخەمان خاڵی نین و، پێم وایە قسە نووسین ئەگەر لەسەر بنچینەی پەیوەست بوون بەواقیعەوەو تەفاعول لەگەڵ كردنی بنیات نەنرێ، زیاتر دەبێتە شتێكی خەیاڵی‌و ئایدیایی، هەمیشە زیندوویی‌و تازەیی‌و پڕ بەپێستی واقیع بوونی قورئانیش وێڕای فەرمووده‌ی خوا بوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیە كەبەداخەوە ئەوانەی قورئان ناناسن لێی بێ خەبەرن.

## ١- پێناسەو شیکردنەوەی چەمك و واتای زاراوەی ( عەلمانیەت ):

هەر لە کۆنەوە چەکی هەرە کاریگەرو بە بڕشتی دوژمنانی خواو ناحەزانی پەیام و بەرنامەکەی بۆ بەرەنگاریو دوژمنایەتی‌یان بریتی‌بووە لە: گۆڕین وشێواندنی ڕاستی‌یەکان (تحريف وتشويه الحقائق)و چەواشەکردنی خەڵکی، بەسەرنج دانیش لە مێژووی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە خوای پەروەردگار لە قورئانی‌دا بۆی باس کردووین ئەو ڕاستی‌یە وەك ڕۆژی ڕوون دەبینرێ، بۆ وێنە:دەبینین دوای ئەوەی (موسى ﷺ) بەپەیامی خواوەو بە بەڵگەو موعجیزە گەلی ئاشکراوە لە گەڵ (فرعون)دا ڕووبەڕوو دەبێتەوەو، فیرعەون دوای ئەوەی بەچاوی خۆی دەبینی چۆن جادووگەرەکانی لە بەرامبەر موعجیزەکانی موسادا بەچۆك دادێن و تەسلیمی پەیام و بانگەوازە خوایی‌یەکەی مووسا دەبن﴿والقي السحرة ساجدين. قالوا آمنا برب العالمين﴾ الاعراف (١٢٠-١٢١) فیرعەون بۆ هەڵگێڕانەوەی ڕاستی‌یەکان و چەواشەکردن و سەر لێتێکدانی جەماوەرە کۆیلەو ژێر دەستەکەی، وا پیشان دەدات کە دەتوانێ مووسا بکوژێ! بەڵام دەیکاتە منەت لەسەر خەڵکەکە کەهەتا ئەو کاتە لەبەر ئەوان نەیکوشتوەو، پاشان وەك پاساودانی کوشتنی مووسا دوو تۆمەتی زۆر ناماقوڵی پاڵدەداتە لا کە گۆڕین و تێکدانی ئایینەکەیان و، ئاژاوەو خراپە پەیداکردنە لە وڵاتدا[1] !!

---

(١) ئێستاش لە ڕۆژگاری ئێمەدا لە سەرتاسەری دونیادا بێ‌دین وبت پەرستەکان بە ناهەق کەوتوونەتە تەقە لەو کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی‌یانەی تێ‌دەکۆشن بۆ گێڕانەوەی حوکمی خواو ڕزگارکردنی گەل و وڵاتەکانیان لە حوکمی تاغووتەکان و بیردۆزەو ڕێچکە شەیتانی‌یەکانیان، کەچی ئەو بێ‌دین ودژ بەخواو خەڵکانە کە خۆیان هەر بڕوایان بە خواو ئایینەکەیشی نیەو ماك و میکرۆبی فەسادو ئاشووب و هەران لە وڵاتداو مایەی نەگبەتی‌و قات و قڕیو بێ‌خێرین!! ئیسلامی‌یە خواپەرست و ڕەوشت بەرزو خەڵك دۆستەکان بە بێ‌دین و ئاژاوەچی تۆمەتبار دەکەن! بەڵێ کافرەکانی ڕۆژگاری خۆشمان هەرچەندە لافی گەشەکردن و نوێخوازیو بەرەو پێش چوون لێ‌بدەن بەڵام هەر لەسەر مەزەب و عەقڵە کۆنەکەی فیرعەونن و هەمان چەکی ژەنگاری ئەویشیان بە دەستەوەیە! ئاخر پێم ناڵێن فیرعەونەکان (دین)یان لەکوێ بوو هەتا خۆیانی لەسەر تووڕە بکەن و وا پیشانی خەڵکی سادەو فەقیرحاڵ بدەن کە ئەوە بەرگری لە دین و ژینی ئەوان دەکەن نەك لە کورسی‌و زەعامەت وبەرژەوەندی‌یە ناشەرعی‌یەکانی خۆیان!!

خوای دادگەرو زانا لەوبارەوە فەرموویەتی ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾ المؤمن (٢٥).

جا یەکێك لەو وشەو زاراوانەی کە بەهۆی گۆڕین و(تحریف) کردنیەوە پشکێکی گەورەی هەبووە لە سەرلێتێکدان و چەواشەکردن و بەهەڵەدا بردنی خەڵکێکی زۆردا، تەنانەت لەنێو چینی خوێندەوارو خۆ بەڕۆشنبیر زانیشدا، وشەی secularism (سیکۆلاریزم)ە، کە تەرجەمەی پڕبەپێست و ڕاستەقینەی بەعارەبی دەبێتە (اللادینیة) واتە: (بێدینایەتی)، بەڵام کاتی خۆی بەمەڵەو بەمەبەستی فێڵ و سەرلێشێواندن بە (العلمانیة) واتە: (زانست چێتی) وەرگێڕداوە کە هەندێك کەس وا دەزانن پەیوەندی بەزانیاری (علم)ەوە هەیەو لە ڕاستیشدا وانیەو کاکڵ وجەوهەری (سیکۆلاریزم) پچڕاندنی ژیان و گوزەرانە لە ئایین و بەها بەرزەکانی‌و داڕشتنی بەرنامەی ژیانە لەسەر بنچینەی بڕوانەبوون بەخواو ڕۆژی دوایی‌و ئایین و بەها (قیمة) بەرزەکانی، ئەوەتا ئینسیکلۆپیدیای بەریتانی (دائرة المعارف البریطانیة) لەپێناسەی وشەی (secularism)دا دەڵێ:

"(سیکۆلاریزم) بریتی‌یە لە جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەیەوێ خەڵکی لە ئەمیەت... گرنگی‌دان بەدواڕۆژ وەرسووڕێنێ بەرەو گرنگی‌و بایەخ دان بەژیان و گوزەرانی دنیا، چونکە خەڵکی لەسەدەکانی نێوەڕاست (العصور الوسطی)دا مەیلێکی زۆریان هەبوو بۆ دووره پەرێزی لەژیانی دنیاو تێوەڕامان دەربارەی خواو ڕۆژی دوایی، جا بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی ئەو جۆرە (مەیل)ە سیکۆلاریزم دەستی کرد بە خۆڕانواندن لەمیانە (خلال)ی گەشەپێدانی دەماری ئینسانایەتی‌دا، بەوپێیەی خەڵکی لەسەردەمی ڕاپەڕینی زانستی‌ی مرۆڤایەتی‌و، بەوەی کەدەگونجێ هەر لەم ژیانە نزیکە دنیایی‌یەدا ئاوات و ئارەزووەکانیان بهێننەدی، ئاوا ڕێڕەوی (secularism) بەردەوام بوو لەسەر گەشەکردنی خۆی لەماوەی سەرجەم مێژووی نوێدا، بەو ئیعتیبارە کە جووڵانەوەیەکی دژی ئایینی‌و دژی مەسیحی‌یەتە"[1].

بەڵێ! ئەوڕووپایی‌یەکان کە بەرهەم هێنەری سیکۆلاریزم و باقی ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤزادەکانی دیکەشن، ئاوا پێناسەی (secularism)مان بۆ دەکەن کە بیردۆزەیەکە لە

---

(١) بڕوانە کتێبی (مذاهب فکریة معاصرة) ی محمد قطب، ل٤٤٥، کە ئەویش لە: (.Encgc Britanica, v.ix, p19)ی وەرگرتوە.

کاردانەوە (رد فعل)ی دامو دەزگاکانی کڵێسادا پەیدا بووەو جەوهەرو نێوەڕۆکەکەیشی بریتی یە لە دوورخستنەوەی تاك و کۆمەڵ لە خواو ڕۆژی دوایی و ئایین و، بنیاتنانی ژیان و گوزەران لەسەر بنچینەی مادەپەرستی و بەس دنیاویستی و گوێ پێ نەدان و ئیهمال کردنی ئایین و ئەخلاق!

ئێستاش دوای ئەوەی لەزمانی خەلك و خاوەنی سیکۆلاریزمەوە گوێمان لەپێناسەکەی بوو و زانیمان چی یەو چۆنە بەپێویستی دەزانم چەند ڕاستی یەکی گەورەو گرنگ بخەینە ڕوو:

**یەکەم:**

مادام ئەورووپایی یەکان خۆیان بەڕاشکاوی و بێ پێچ و پەنا دەڵێن: (سیکۆلاریزم) واتە: (بێ دینایەتی)، نەدەبوو پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی بیردۆزەی گۆڕین بەمەبەستی سەرلێشێواندن و چەواشەکردن لەلای خۆیانەوە واتاو مەبەستی دیکەی بۆ هەڵتاشن و جورئەت نەکەن کە وەك خۆی بە ڕاشکاوی بیناسێنن!

**دووەم:**

مادام سیکۆلاریزم زادەو هەڵقوڵاوی کۆمەڵگا ئەورووپی یەکانەو بۆ ئەوان کە بۆ ماوەی چەندان سەدەی دوورو درێژ -بەرلەوەی کۆدەتا بکەن بەسەر دامو دەزگاو پیاوانی کڵێسادا- گیرۆدەی تەڵەو داوی قەشەو پاپایەکان و ئەفسانەکانیان و خۆسەپاندن و سۆغرەو بێگارو باج و پیتاکی جۆراو جۆر ئەستاندنیان بوو بوون و، لەسۆنگەی ئەوەشەوە بەمەعنای وشە لە تاریکستانی نەزانی و نەفامی ئەنگوستەچاودا دەژیان، بەڵێ سیکۆلاریزم و باقی ڕێچکەو بیردۆزەکانی دیکەی ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژئاوایی یە گیرخواردوو و سەرگەردانەکان شتێکی سرووشتی و چاوەڕوان کراو بووە، چونکە هیچ چارەو پەنای تریان شك نەبردووەو پیاویش کە بەڕووبار داچوو چەنگ بۆ پووشێش دەبات!

بەڵام ئێمە بۆچی یەکسەرو بێ سێ و دوو تووتی یانە قسەو هەڵوێستی ئەوان لەکات و شوێنێکی جیا لەوەی ئەواندا دووبارە بکەینەوە؟! بەر لەوەی بیر بکەینەوەو لەخۆمان بپرسین کە: ئایا ئایینی ئێمەو بارودۆخی ئێمەش کت و مت هەر وەك ئەوەی ئەوانە! تاکو ڕەواو ڕاست بێت لە هەڵوێست و ڕەفتارمان لاسایان بکەینەوەو وەك ئەوان بکەین، یان جیایەو پێویستە هەڵوێستێکی جیاش بنوێنین؟!

بەڕاستی من کەمەڵوێستی ئەو جۆرە کەسانە ناوا دەبینم هەر ئەوەم دێتە بەرچاو کە یەکێك (دوو پشك) بە پێیەوەی دابێ‌و لەتاو ئازاری پێ‌ی دەست بکات بە هەڵپەڕین و هەڵبەزو دابەز، یان لەحەژمەتی (دان ئێشە) سەری بسوورێنێ‌و خۆی بەدارو دیواردا بکێشێ، یەکێکی دیکەش هەر لەخۆوەو بەبێ هۆو بێ‌ئەوەی لەهۆکاری هەڵبەزودابەزو سەرسووڕاندنەکەی وردبێتەوەو حاڵی‌بێ مەسەلە چی‌یە، لاسای بابای دووپشك پێوەدراوو ژانەدان گرتوو بکاتەوەو وەك ئەوان دەست بکات بەهەڵپەڕین و خۆ بەدارو دیوار کێشان!!

ئاخر برادەر! بابای ئەورووپی بێ چارە کە بەدەست ئاینێکی شێوێنراوو گۆڕراوەوە گیری خواردوەو هەر لە ئەسڵیشدا ئەو ئایینە -کە ئایینی مەسیحی‌یەتە- بۆ ڕۆژگارو باروودۆخی وی ڕەوانە نەکراوە، وە لەئایینی ڕاست و دروست و پڕ بەپێستی مرۆڤایەتی‌و دەستکاری نەکراویش -کە ئیسلامە- بێ‌ئاگایە جگە لە هانابردن بۆ ئەو بیرەدۆزەو ڕێچکانەی کە عەقڵی پێیان شکاوەو بەرهەمی هێناون چ ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەم دایەو خاکی کوێ بەسەر خۆی‌دا بکات و ڕوو لەکوێ بکات!! بەڵام تۆی خۆ بەمسوڵمان زان کە قورئان و سوننەت و ئەزموونی سێزدە (١٣) سەدە حوکمی ئیسلامیت لەبەردەست دایەو ڕۆژێك لەڕۆژان کێشەیەکی وەك: دادگای سانسۆری بیروباوەڕ(محاکم التفتیش)و پسوولەی لێبوردن (صکوك الغفران)و، (برۆنۆ)[1] بە چیخەوە سووتێنران و، تۆبە بە (گالیلۆ)[2] کران و، ڕێ لەعەقڵ بەکارهێنان و زانست وەدەست هێنان و... هتدت نەبووە، قەت زاناو پێشەوا ڕەسەنەکانی ئایینەکەت وەك قەشەو پاپاکان لەگەڵ دەرەبەگ و سەرمایەدارەکاندا نەبوونە پێڕێك و ببنە ملۆزمی جەماوەری چەوساوەو ئەدارو وەك جووتە گورگی هار بەربنە گیانی کۆمەڵگا... بەڵێ! تۆیەکی ئاوا بۆچی خۆت هەتڵە دەکەی‌و چاو لەم و لەو دەکەی‌و ڕەفتاری نامەنتیقی‌یانە لەگەڵ ئایین و کۆمەڵگاو باروودۆخی تایبەتی خۆتدا دەکەی؟!

---

(١) مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە دامو دەزگای کڵێسا لەسەر ئەوەی کە (برۆنۆ) باسی خولانەوەی زەوی کردبوو بەدەوری ڕۆژدا، بەفەرمانی پاپا حوکمی سووتاندنی دراو لە (چیخ)ێکیانەوە پێچاو سووتاندیان!

(٢) (گالیلۆ)ش لەسەر ئەوەی باسی خڕێتی زەوی کردبوو بۆ ئەوەی حوکمی لە سێدارەدانی نەدەن ناچاربوو بچێتە خزمەت پاپاو دەستی ماچ بکات و لەو قسانەش کە کردوونی پەشێمان بێتەوەو تۆبە بکات.

**سێیەم:**

من بۆیە وشەی (عەلمانیەت) بەکاردێنم چونکە ڕای ئەو توێژەرەوانەم پێ بەهێزە کە دەڵێن: کاتی خۆی وەرگێڕە عارەبەکان وشەی (secularism)یان بە (العالمانیة) وەرگێڕاوە، واتە (الدنیویة) کە لە کوردیدا دەبێتە (دنیا پەرستی) یان (دنیا ویستی)، دەڵێن بەلام دوایی بۆ ئەوەی وشەکە لەسەر زمان سووک بێت گۆڕراوە بۆ (العلمانیة)، بەلام عەلمانیو بێدینەکان بۆ چەواشەکردنی خەڵکیو سووک کردنی چارەی عەلمانیەت، بە(عیلمانیەت) نوتقیان پێ کردووە!

جا لەڕاستیدا کە لەم مەسەلەیە ورد دەبمەوە هەر وشەی (ئیستعمار)م دێتە بەرچاو کە چۆن ئیمپریالیزمی جیهانیو کلکەکانیان لەنێو مسوڵماناندا بۆ فریودانی خەڵکیو سووک کردنی ڕەزای قورسی ئیمپریالیستە جیهانخۆرەکان وشەی (إستعمار)یان کردە ناوو شۆڕەتی داگیرکەران و بەغارەت بەرانی خێرو بێری جیهانی ئیسلامی، بەلام سەرەنجام فێڵەکەیان سەری نەگرت و لەجیاتی ئەوەی مەعنای جوان و دڵگیری وشەی گۆڕین کە بریتییە لە (ئاوەدانیو خێروخۆشی) چارەی گرانی ئیمپریالیستەکان سووک بکات و ڕووی ڕەشیان سپی بکاتەوە، بەپێچەوانەوە چارەی قورسی ئیمپریالیستەکان و ڕووی تاڵخ و ڕەشیان، چارەو ڕووی ئەو وشە گەش و جوانەیان تێك داو، ئێستا لەنێو ئوممەتی ئیسلامدا خەڵکی مسوڵمان حەساسیەتێکی زۆریان بەرامبەر بەوشەی (إستعمار) هەیەو حەز بە بیستنی ناکەن!

جا من دڵنیام کە چارەنووسی عەلمانیەتیش، جا چ بە عیلمانیەت نوتقی پێ بکرێ چ بە عەلمانیەت وە چ بە بێدینی یان دنیاپەرستی، سەرەنجام هەر وەك چارەنووسی ئیستیعمار دەبێو دیارە هەقی خۆشیەتی، چونکە ئەگەر ئیستیعمار داگیرکردنی ماددیو بە تاڵان بردنی خێرو بێری وڵات بوو، عەلمانیەت مەعنەوییو -بەخەیاڵی خۆیان- لەبەین بردنی ئاین و عەقیدەو ئەخلاقی ئوممەتەو، گومانیشی تێدا نیە کە ئی یەکەمیان لەچاو هی دووەمیان زۆر سووکترو کەم مەترسی ترە!!

**کورتەی قسان:**

سیکۆلاریزم لەنێو کۆمەڵگایەکی تایبەت و بارودۆخێکی فیکریو کۆمەڵایەتیو سیاسی تایبەتدا کە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایە پەیدا بووەو، دیارە ئەو کۆمەڵگایەش خۆیان چەمك و واتاو مەبەستیان بۆ دیاری کردوەو، ناگونجێ ئێمە لەلای خۆمانەوە مەعناو مەبەستی دیکەی -کە

خۆمان حەزمان لێیەو بەچاکی دەزانین– تێ بخزێنین، چونکە ڕەفتاری وا هەم خیانەتە بەو بیردۆزەو ڕچەیەو، هەم بەو خەڵك و كۆمەڵگایەش كە ئێمە بەهۆی گۆڕین (تحریف)ی وشەی گۆڕینەوە بە سەهوویان دەبەین و چەواشەیان دەكەین، كەواتە بەلای كەمەوە ئەگەر هەر ناشڵێین (بێدینایەتی) یان (دنیا پەرستی) بۆ پێناسەی وشەی (secularism)، با بڵێین: (دنیا گەرایی) یان (دنیاویستی). بۆئەوەی هەر چۆن بێ تەعبیرەكەمان ئەندازەیەك لە ماهیەت و جەوهەری وشەی گۆڕینەوە نزیكتر بێت[1]، جا بۆیە ئێمە لەم نووسینەو هەر نووسینێكی دیكەشماندا ئەگەر وشەی (اللادینیة – بێدینایەتی)یش بەكار نەهێنین، ئەوە وشەی عەلمانیەت یان دنیاگەرایی بەكار دێنین، جاری واش دەبێ هەر عەینی وشەی ئەسڵی بە ئیملای كوردی بەكار دێنین كە (سیكۆلاریزمە)ە، هەندێك جاریش بۆ بابایەكی یان كۆمەڵێكی سیكۆلاریست وشەی (لائیك) كە هەر هەمان سیكۆلاریستەو لە زمانی فەرەنسیدا بەكاری دێنن و فارسیش لەوانیان خواستۆتەوە، بەكار دێنین.

## ٢- ئەزموونی قەوارەی سیاسی كورد لە كوردستانی سەر بە عێراق و چەند ڕاستییەكی تاڵ:

پەیدابوونی كیان و قەوارەی سیاسی خولیاو ئاواتی لە مێژینەی گەلی كوردە لەهەموو بەشەكانی كوردستانداو ئەو گەلە ئازاو مەردە لەو ڕێیەدا خەباتێكی دوورو درێژی پڕ خەم و خوێن و كەندو لەندی كردوە بەتایبەت لەبەشە كوردستانی سەر بەعێراق دا كە لە هەمووان ئاشكرایە دوای دەیان ساڵ خەباتی سیاسیو چەكداریو لە ئەنجامی ڕاپەڕینی جەماوەریی شكۆمەندی ساڵی (١٩٩١)و پاشان كۆچڕەوی چەند ملیۆنیدا باروودۆخ بەشێوەیەك گۆڕا كە زەمینە بڕەخسێ بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن (انتخابات)و پاشان پێكهێنانی پەرلەمان و دواتریش دامەزراندی حكومەتی هەرێم لە بەشە كوردستانی سەر بەعێراق دا، بەڵام بەداخەوە دوایی چی

(١) بڕوانە (ورقة ثقافية في الرد على العلمانيين) ی د.محمد یحیی، بۆ زیاتر ئاگاداریش لە پووچەڵی ڕێچكەی عەلمانیەت دەتوانی سەرنجی ئەم كتێبانە بدەی: (تهافت العلمانية) د.عمادالدين خليل؛ (الإسلام والعلمانية وجها لوجة) د.يوسف القرضاوي؛ (العلمانية) د.سفر الحوالي؛ (مذاهب فكرية معاصرة) الأستاذ محمد قطب.

ڕووی‌دا؟! زنجیرەیەك شەڕو کوشتاری نێوخۆی (دەوەن بە ئاش ئاسا) کە جگە لە تێچوونی پەرلەمان و حکومەت و لەت بوون و دابەش بوونی بەشە کوردستانی عێراق! سەدان کوشتەو بریندارو سەقەت و ئاوارەبوونی هەزاران ماڵە کوردی بێ‌چارەو دەرەتانی لێ کەوتەوەو ئێستاش مەگەر هەر خوا بزانێ چی دیکەی بەدوادا دێت!

بەڵێ! حەیف و مەخابن! لایەنە سیاسی‌یە سیکۆلاریزمەکانی کوردستان لەجیاتی جێ‌بەجێ کردنی ئەو هەموو گفت و بەڵێنە سەوزو زەردو سوورە جوان و شیرینانەی کە بەخەڵکیان دا، بۆ گیانی یەکترو گەل و وڵاتی کەساس و بێکەسیشیان بوونە گێژەڵووکە تێکەوە پێچەرو لێزماوی ڕاماڵەرو کارێکیان بە گەل و وڵاتی بێ ئاوونیشان کرد با بەدەواری شڕی نەکردبێ، بێ‌ئەوەی لەخۆیان بپرسن ئایا ئەوەی بەشانازی کردن و بەدەست و بازووی خۆ هەڵاگوتنەوە لووڵی دەدەن و ڕای دەماڵن کێ‌یەوکوێ‌یە؟!

ئینجا لەئاکامی ئەو هەراو کێشەو یەکترهێنان و بردنەشدا ئاوزڕان و ئاشیرین بوون لەدەرەوەی وڵات و، دوژمن پێخۆشبوون و زەمینە خۆشبوونی دەست تێوەردانی وڵاتانی ئاوچەکەو دوورتریش سەرباری خەمان!

کەچی برادەرانی لائیك ئێستاش قبووڵ ناکەن هیچ کەس پێیان بڵێ: برادەرینە! جارێکی دیکە بە خۆتاندا بچنەوەو لەڕێچکەو بیردۆزەکانتان ورد بنەوەو لێمان بسەلمێنن کە دەڵێین دەردی کۆمەڵگای ئێمە لەوە قورسترو قووڵترە کە هەروا بەسێنایی چارەسەر بکرێ‌و تەنها بە پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسی –کەمافی شەرعی‌و سرووشتی کوردو هەر گەلێکی دیکەشە– لەخەم برەخسێن و بەختەوەر بین، بەڵکو وێڕای ئەمەش ئێمە پێویستیمان بە شۆڕشێکی عەقیدەیی‌و فەرهەنگی‌و ئەخلاقی‌و خۆ گۆڕینێکی بنجی‌و ڕیشەیی هەیە، تاکو بتوانین بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بەرێوە بچین و پێکەوە بژین و سوودو بەهرە لە کیان و قەوارە سیاسیەکەشمان وەربگرین، ئەی ئەوە نیە خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿.. إن الله لايُغير مابقوم حتى يُغيروا ما بانفسهم...﴾ الرعد.

بەڵێ! با بە هەوڵ و هیممەتی هەموو لایەك کردوکۆش بۆ ئەوە بکەین کە کیان و قەوارەی سیاسیمان لەسەر بناغەی ڕەسەنایەتی ئیسلامی (الاصالة الاسلامية)یمان بنیات بنێین، بۆ ئەوەی کیانێکی یەك دەنگ و یەك ڕەنگ و دامەزراوو نەلەخشاو بێت، نەك هەر بەپارەو داهاتی خەڵکی کوردستان بەدەست و زمان بکەوینە وێزەی یەکدی‌و کۆمەڵگاکەمان چەندان سەدە

بگێڕینەوە دوایەو شەڕو کێشەو گوریس پچڕکێنەکانی میرنشینەکانی بابان و ئەردەلان و، سۆران و بۆتان دووپات بکەینەوە، کە ئەوانیش لەبەر نەزانیو بیرتەسکیو خۆپەرستییان و پاشان بە فیت و دەست لەپشت دانی صەفەوییەکان و عوسمانییەکان زۆریان یەکتر هێناو بردو گەلێک سەروەری ئەیان شەڕی دەوەن بە ناشیان لەمێژووی کوردو کوردستاندا تۆمار کرد!!

## ٣- پەیوەندی کارتێك کردنی دووسەرە (دیالیکتیکی)ی ئیسلام و کورد:

شتێکی ئاشکرایە کە هەر لەو کاتەوە کە ئیسلام و کورد ئاوێتەی یەکتر بوون و بە یەك ئاشنا بوون، هەر کامێکیان کاریگەری هەبووە بۆ سەر ئەویتر، کەواتە ئەوانەی کە ئەم جۆرە پرسیارانە دەکەن: "لە پێشدا ئیسلام یان کورد؟!" یان "ئیسلام بەقوربانی کورد بکەین یان کورد بە قوربانی ئیسلام؟!" ... وا دیارە شارەزای ئیسلام و مێژووی گەلەکەشیان نین! چونکە هەر کەسێك بە ئەلف و بێی ئیسلام ئاشنا بێت، دڵنیا دەبێ لەوەی کە ئیسلام بۆ هەموو گەلانی دنیا سەراپا خێرو بەرەکەت بووەو مایەی بەختەوەریو عیززەتمەندیو سەرفرازی دنیاو قیامەتە، گەلی کوردیش دوای ئەوەی نێو کابووسی ئیمپراتۆری فارس و ڕۆمی لەسەر شان و سینگ لاچوو و بەریستی ئازادی خۆی ئیسلامی لە باوەش گرت، دەیان سەروەریو جوامێری لە بوارەکانی زانست و پەروەردەو بەرەکانی جیهادو بەرەنگاریدا بۆ ئیسلام تۆمارکردو، گەلێك خزمەتی گەورە گەورەی پێشکەش بە ئوممەتی ئیسلام کردو، سەدان کەڵە پیاوی زاناو بلیمەت و سەرکردەو قارەمانی لێهاتوو و بە هەیبەتی لە قوتابخانەی ئیسلام دا پێگەیاندو پەروەردەکرد، کە ناوو ناوبانگی کوردیان بە دنیادا بڵاوکردەوەو ناوی گەلی کوردیان لە سەرەتای لیستی گەلانی خزمەتگوزارو فیداکاری نێو ئوممەتی ئیسلامیدا تۆمار کرد.

کەواتە: هەر ئەسڵەن پرسیاری سەفسەتییانەی وەك: "لە پێش دا ئیسلام یان کورد؟" هەڵەیە، چونکە هەر وەك چۆن ئایین بۆ ئینسان نێرراوە، ئینسانیش بۆ دینداری خوڵقێنراوە، بەڵێ (دین) بۆ (ژین)ەو (ژین)یش دەبێ بەپێی (دین) بەڕێوە بچێ. هەر بۆیە (دین)ێك کە لە (ژین) دادەبڕێ -وەك ئایینی گۆڕاوی نەصرانیەت- دەبێتە شتێکی بۆش و، (ژین)یش ئەگەر بە گوێرەی تەوجیهاتی(دین) بەڕێوە نەچێ گەندەڵ و پۆخەڵ دەبێ -وەك ژیانی سەرگەردانانەی ڕۆژئاواییەکان-، مەسەلەی کوردو ئیسلامیش بەهەمان شێوە، کورد بەهۆی ئیسلامەوە کیان و

کەرامەتی پارێزراو دەبێو، ئیسلامیش بە هۆی کوردو غەیری کوردیشەوە لە گەلانی مسوڵمان بەرێوە براوەو دەبرێو پارێزراوەو دەپارێزرێ.

دیسان پرسیاری: "ئیسلام بەقوربانی کورد بکەین یان کورد بە قوربانی ئیسلام؟!" پرسیارێکی هەڵەو بێجێیە، چونکە مادام ئایین بۆ بەختەوەرکردنی ئینسان هاتبێو، ئینسانیش بۆ بەندایەتیکردن بۆ خوا خوڵقابێت ﴿وَمَا خَلَقتُ الجِن وَالإنسَ إلا لِيَعبُدُونِ﴾ الذاريات (٥٦)، ناچار نین یەکێك لە ئیسلام و کورد بە قوربانی ئەوی دیکەیان بکەین و لە ژێر پێیدا بیپلیشێنینەوە، بەڵکو بەکورد ئاڵاو بەیداغی ئیسلام و بە ئیسلامیش سەری کورد بەرزو بڵند دەبێو هەردووکیان خزمەتی یەکتر دەکەن و مەداری یەکتر سان دەکەن و[1]، بەپێچەوانەی بۆچوونی‌هەندێك کەسی فامکاڵ و فەقیرحاڵەوە ئیسلام و کورد هیچ کامیان وەسیلە نین و ئەوی تریش ئامانج (هدف)، بەڵکو هەردووکیان لە یەك کاتدا بۆ یەکتر بەدوو ئیعتیباری جیاجیا هەم وەسیلەن و هەم ئامانجیش. ئینجا ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژانیش کورد بەهۆی سادەیی خۆیەوە بەناوی ئیسلامەوە فێڵی لێ کرابێو بەشی خورابێ ئەوە ئیسلام لەو هەڵەو تاوانە بەرییەو، پێویستە کوردیش گلەییو گازاندەی خۆی ئاڕاستەی سادەییو فەقیرحاڵی خۆیو فێڵبازیی ناحەزانی بکات، نەك ڕووی ڕەخنەو گلەیی بکاتە ئیسلامێك کە هەم بەکوردی مسوڵمانی گوتوە سادەو فەقیرحاڵ نەبێ ﴿يَاأَيها الذين آمَنوا خُذوا حِذرَكُم﴾ النساء (٧١)، وە هەم بە ناحەزەکانیشی گوتوە فێڵبازو تەڵەکەچی نەبن (..مَن غَشنا فَلَيسَ مِنا) رواه البخاري.

## ٤- کوردایەتیو سەربەخۆیی لەنێوان ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان دا:

گەلێك جار بە ناهەق تۆمەت بگرە بوختانی ناڕەوا پاڵ دەدرێتە لای ئیسلامییەکانی کوردستان. لە دوو ڕووەوە، یەکەم: کە ئیسلامییەکان بڕوایان بە کوردایەتی نیەو بەخەم گەل و

---

(١) ڕەنگە هەندێك کەس مەسەلەی خەبات و فیداکاریو خۆبەخت کردن لەپێناوی خوادا و شەهید بوون لەو پێناوەدا ئیشکالیان بۆ دروست بکات و بڵێن: ئەدی ئەوە نیە ئینسان بە قوربانی دین بووە!! بۆیە دەڵێین: لەڕاستیدا شەهیدبوون و خۆبەخت کردنی ئینسان -کوردو غەیری کورد- لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئایین و ڕەزامەندی خوادا لەڕوانگەی ئیسلامەوە گەورەترین و بەرزترین جۆری سەرفرازییو بەمراد گەیشتنی ئینسانە کە وەدەست هێنانی پلەوپایەی شەهیدیو شادبوونە بەدیداری خواو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوە ﴿ وان الدار الآخِرَةَ لَهِيَ الحَيَوان لَو كانوا يَعلَمُون﴾ العنكبوت (٦٤).

وڵاتیانەوە نین، دووەم: کە ئیسلامی‌یەکان وابەستەی بۆچوون و سیاسەتی خەڵکی دیکەن –دیارە زیاتر مەبەستیان عارەب و فارس و تورکە، کە سێ گەلی مسوڵمانی دراوسێی کوردن و بەپێی نەخشەو پیلانی شوومی ئیمپریالیزمی جیهانی کە لە پەیمانی کافرانەی (سایکس پیکۆ)دا دەرکەوت نیشتیمانی کورد (کوردستان)یان بەسەردا دابەشکرا–، جا هەر چەندە ئێمە خوا پشتیوان بێ لە دوو خاڵی سەربەخۆدا تیشك داوێینە سەر هەرکام لەم دوو تۆمەت و بوختانە، بەڵام لێرەشدا هەر بەکورتی‌و زیاتریش بەمەستی بەراورد (مقارنة)ی نێوان ئیسلامی‌یەکان و لائیکەکان دەڵێین:

ئایا ئەو ئیسلامی‌یانەی کە لەحاڵێکدا لەهەموو سامان و داهاتی کوردستان –مەگەر قوتی لایەموت– بێ بەشن و لەبارودۆخێکی ئابووری زۆر سەخت و دژواردا دەگوزەرێنن –بە تایبەت ئەوانەیان کە خەباتی چەکداری دەکەن– و لەسۆنگەی ئەو ژیان و گوزەرانە تەنگ و سەغلەتکەرەوە فشارێکی زۆریان کەوتۆتە سەر، بەڵام بێ گوێدانە نەداری‌و قەرزداری بەردەوام و شێلگیرانە سەرگەرمی زیندوو کردنەوەی کۆمەڵگاکەیان و ئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەیانن، بەهۆی بێدارکردنەوەو شارەزا کردنی گەلەکەیان لە عەقیدەو عیبادات و ئەخلاق و ئاکاری ئیسلامی لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی پێشکەش کردنی کۆمەڵێك خزمەتگوزاری‌ی جۆراو جۆری وەك دروست کردنی مزگەوت و قوتابخانەو نەخۆشخانەو چاککردنی پردو ڕێگاوبان و هاوکاری کردنی هەتیوو نەدارو لێقەوماوان، دەگونجێ‌و بێ‌وێژدانی نیە تۆمەتی کەمتەرخەمی‌و گوێ‌نەدان بە گەل و وڵاتیان پاڵ بدرێتە لا؟![1].

دیسان ئایا ئەو ئیسلامی‌یانەی کە لە کاتێکدا حیزب و تاقمە لائیکە بەشەرهاتوەکانی کوردستان بەفیتی وڵاتانی دراوسێ‌و بیانی‌و دەست لە پشت دان و هاندانیان زنجیرە شەڕو

---

(١) هەرچەندە ئیسلامی‌یەکانی کوردستان بەگشتی لەڕووی خەباتی ڕزگاریخوازی‌یەوە ساوا بوون و درەنگ دەست بەکاربوون، بەڵام ئەوانەیان کە تەمەنیان هەراش ترە وەك شەخص بەشداری‌یان کردوە لەنێو یەکێك لەکۆمەڵ و حیزبە لائیکەکاندا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەو کاتە ئاڵاو قیادەیەکی ئیسلامی لەئارادا نەبووە، ئینجا لەو کاتەشەوە کە وەچەی نوێ (الجيل الجديد)ی ئیسلامی پێ ڕاگەیشتوە هەرچەندە هەندێکیان کەمتەرخەم بوون و بەشداری‌یان نەکردووە، بەڵام هیچ کەسیش ناتوانێ خەبات و فیداکاری مەردانەی پێشمەرگە چەنگ بەخوێنەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی‌و شەهیدە سەربەرزەکانی لەبیر بکات.

کوشتارێکی نێوخۆی بێ ئاکامیان بەرپاکردو هەتا ئانیشکان دەستیان بەخوێنی کورد سوور کرد. بەڵام ئەوان -واتە ئیسلامی‌یەکان- وێڕای هەبوونی فشاری جۆراو جۆر قبووڵیان نەکرد بچنە نێو ئەو هاوکێشە شووم و بێ‌خێرەی شەڕی کورد کوژی‌یەوە، ئایا کامیان لە ئیسلامی‌یەکان و عەلمانی‌یەکان کوردایەتی‌و سەربەخۆیی خۆی پاراستوەو کامیشیان لەدەستی داوەو دۆڕاندوویەتی؟!

بەڵێ! بێگومان (کوردایەتی)و (سەربەخۆیی) بەر لەوەی دروشم و شیعار بن هەڵوێست و ڕەفتارن، ئاشکراشە کە دروشم و شیعار بە قەڵەم و مەرەکەب و لەسەر کاغەزو پەڕۆو دیوار دەنووسرێن، بەڵام هەڵوێست و ڕەفتار کردارن و دەبێ لە مەیداندا ڕابنوێنرێن و تۆمار بکرێن!

هەڵبەتە ئەو سەر بڵندی‌یەی ئیسلامی‌یەکان و ڕوو سووری‌یەشیان لەبەردەم خواو خەڵکدا زادەو بەرهەمی شان و شەوکەوت و لێهاتوویی خۆیان نیەو، بەس بەرەکەت و پێزی پابەندی‌یانە بە بەرنامەی خواوەو لانەدانیانە لە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایانﷺ.

## ٥- ئایا هاوکاری کرانی ئیسلامی‌یەکان لەلایەن مسوڵمانانی دەرەوەی کوردستانەوە بە تۆمەت دادەنرێ؟!

هەرچەندە ئێمە وەك ئیسلامی‌یەکانی کوردستان گلەییمان لە کەسایەتی‌و ڕێکخراوو دامو دەزگاو کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکانی دەرەوە بە عارەب و تورك و فاس و ئەوانی دیکەشەوە هەیە، کە وەك پێویست خەمیان لەکێشەی ڕەوای گەلی ستەمدیدەی کورد نەخواردوەو بگرە هەر ئیهمالیشیان کردوەو ئەم ڕاستی‌یەشمان بەرەو ڕووی خۆشیان گوتوە لەو شوێنانەدا کە بینیومانن[1]، چونکە لە ڕاستی‌دا لەڕوانگەی ئیسلامەوە مسوڵمانان هەموو برای یەکترن ﴿إنما المؤمنون إخوة﴾ الحجرات (١٠) و هیچ کامیان ئیمتیازو زیادی بەسەر ئەوانی تردا نیە مەگەر بە هۆی پارێزکاری (تقوى)یەوە، کەواتە کێشەو گرفتی هەر کامێکیشیان وەك ئی ئەوی‌تر وایەو، بەم پێ‌یە هیچ جیاوازی‌یەك لە نێوان کێشەی گەلی کوردو گەلی فەلەستین یان کشمیر یان چیچان

---

(١) بەندە لەچەند سەفەرێکدا بۆ ئێران و پاکستان و سعودیەو تورکیاو سووریاو لوبنان و ئوردن و سودان و یەمەن... ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ ئەو کەسایەتی‌و کۆمەڵ و ڕێکخراوە ئیسلامی‌یانەدا باس کردوەو جاری واش بووە موناقەشەو مشت و مڕی توندیشمان بووە.

یان بۆسنە یان ... هتددا نیەو، ناکرێ بە بانێکەو دوو هەوا و (الکیل بمکیالین) لە گەڵ کێشەو گیروگرفتی گەل و کۆمەڵگاکانی نێو ئوممەتی ئیسلامی ڕەفتار بکەین هەندێکیان بەهەند بگرین و پشتیان بگرین و ئەوانی دیکەش پشت گوێ بخەین و بەکەم سەیر بکەین!

بەڵام لەگەڵ ئەم ڕاستی‌یەشدا شتێکی بێ‌جێو دوور لەویژدانیشە کە برە هاوکاری هەندێك لەو ئیسلامی‌یانەی دەرەوەی کوردستان بۆ ئیسلامی‌یەکانی کوردستان بکرێتە مایەی تۆمەتبارکردن و گومانی بەد پێ بردنیان، ئاخر مادام گلەییمان لێیان هەبێ بەهۆی کەمتەرخەمی‌و بێ هەڵوێستی‌یان بەرانبەرمان، چۆن نەبێ دواییش هاوکاری‌و پشتیوانی لێکردنەکەیان بکەینە دەستە چیلەی تۆمەت و گومانی خراپ!!

بەڕاستی سەیرە! هاوکاری هاوپێچ بە پیلان و مەبەستی سیاسی ئەمریکی‌و ئەوروپی کە بە فیتی ئەوان کورد بێ خانەو لانە بووەو نیشتیمانەکەی بەش بەش کراوە! بەباش و شایستەی ڕێزو تەقدیرو پێهەڵگوتن بزانین و کەسیش بۆی نەبێ نیشانەی پرسیاری لەسەر دابنێ، بەڵام برە هاوکاری‌یەکی بێ موقابیلی چەند (فرد)ێکی خێرخواو دەوڵەمەندو ڕێکخراوێکی ئیسلامی بەشتێکی خراپ و بە تۆمەت لەقەڵەم بدرێو، پاشان سەدان خەون و خەیاڵ و ئەفسانەی سیاسی‌و موخابەراتی لەسەر هەڵبچنرێ، کە فلان کۆمەڵە ئیسلامی‌یە وابەستەیەو دژی کوردو کوردستانەو وایەو وایە!!

## ٦- تاقمە لائیکەکانی کوردستان و ئیددیعای بەرگری لەئیسلام و موقەددەساتی کورد!

بێگومان ئێمە وەك مسوڵمان و ئیسلامی هیچ کات لەکۆمەڵێکی عەلمانی چاوەڕێ ناکەین بەرگری لەئیسلامێك بکات کە لەڕەگ و ڕیشەوە لەگەڵی ناکۆکەو وەك بەرنامەی ژیان و گوزەران بڕوای پێ نیەو هەر بۆیەش ڕێبازی (اللادینیة-العلمانیة) بێ‌دینی‌و عەلمانیەتی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو، جاروباریش بەمەبەستی دڵڕاگرتنی جەماوەر هەندێك شیعارو ڕێو ڕەسمی ڕواڵەتی ئیسلام لەخۆیان و دام و دەزگاکانیاندا پێشان دەدەن وەك ڕێزگرتن لەمەلاو شێخ و مانگی ڕەمەزان و خوێندنی چەند ئایەتێکی قورئان لە بۆنە (مناسبة)کاندا... هتد، بەڵام بۆمان هەیە بپرسین: ئایا بە چ پێودانگێك بەرهەڵدکردن و بولر پێدان و بگرە لەباوەش گرتن و دەست

لەپشت دانی لائیکەکانی کوردستان بۆ هەندێك دەستەو تاقمی چەند نەفەرەی بێ دین و (ئیباحی)و ڕەوشت نزم کە بە ڕاشکاوی‌و بێ پەردە داوای تێکەڵاوی جینسی (الشيوعية الجنسية) و گوێ نەدان بەیاساو دەستوورەکانی شەریعەت و داب و نەریتەکانی کۆمەڵگاو نەمانی خێزان و... هتد دەکەن و لە بڵاوکراوەکانیاندا – کە لەژێر سایەی هەردووك لەتکە حکوومەتەکەی هەرێمدا دەردەچن[1] بەئاشکراو بێ ڕەچاوکردنی هیچ سنوورو پاراستنی هیچ شعوورێك جنێوو قسەی سووك بە خواو پێغەمبەرﷺ و ئیسلام و قورئان و شەرع و مەلاو... هتد دەدەن! بەڵێ ئایا بوار پێدان و بەرهەڵداکرنی ئەو دەستەو تاقمە هەرچی‌و پەرچی‌و فیکر ڕزیوو ڕەوشت تەپیوانە بە چ پێ‌و دانگێك لەگەڵ لاف لێدانی کوردایەتی‌و بە تەنگ کوردەوە بوون و بەرگری کردن لە موقەددەساتی کورد، دانووی دەکوڵێ‌و پێکەوە دەگونجێن!

یان برادەرانی عەلمانی حوکم بەدەستی کوردستان پێیان وایە ئیسلامی‌یەکان هێندە سادەو بێ ئاگان کە خۆیان بەرنە ڕیزی ئەو هەرچی‌و پەرچی گەندەڵ و پەندەلانەو بەخەیاڵی خۆیان ئیسلامی‌یە ڕەوشت بەرزو پاکەکان و ئەو بێ‌دینە پیس و ڕەوشت نزمانە پێکەوە سەرگەرم بکەن و خۆشیان بکەنە پیاو چاك و حەکەم لە بەینیان داو جار جارەش بە بیانووی لێك کردنەوەو ناوبژی‌یەوە سەرو زڵەیان تێ بسرەوێنن و، لەو نێوەشدا خۆیان بە چاکەکارو دیندار دەربێنن! ئاخر فێڵ و پیلانی وا چۆن سەر دەگرێ براله! مەگەر ئێمەی ئیسلامی هێندە بیر کورت و ڕواڵەت بین و بێ‌هەواڵین هەر دڕێشە دەبینین و ئەو دەستەش نابینین کە دڕێشەکەی گرتووەو دەیوەشێنێ!

بەهەر حاڵ ئێمە حەز دەکەین برادەرانی عەلمانی یان دەست لەدژایەتی کردنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی ئیسلام وئیهانەکردن بە (شعائر)و بە زاراوی ئەوان (مقدسات)ی ئیسلام هەڵگرن؛ چونکە خوای دادگەرو تۆڵە ستێن فەرموویەتی ﴿... وَمَن يُعظِم شعائرَ الله فإنها مِن تقوى

---

(١) ئەو بڵاوکراوانەی کە لەلایەن ئەو تاقمە بێ دین و سەر لێ شێواوو گەندەڵانەوە دەردەچن زۆرن و لەهەموو جێگایەك هەن و، لە بڵاوکراوەکانی هەردووك حیزبی دەسەڵاتداری حوکمڕانیشدا بە کتێب و کۆڤارو هەفتەنامەو ڕۆژنامەوە قسەی توانج و پلاری زۆرو زەوەند هەن کە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ناڕاستەی ئیسلام و مسوڵمانان دەکرێن، وەك ئەوەی کورد هیچ گیروگرفتێکی نەمابێ بێجگە لە نەهێشتنی دین و ڕەوشتەکەی!!

القُلُوب﴾ الحج (٣٢)، یان ئەوەیە با چیتر لافی دڵسۆزی بۆ کوردو ڕێزگرتن لەئایین و دروشمەکانی گەل کورد لێ نەدەن، چونکە گەلی مسوڵمانی کورد ناتوانێ بڕوا بەخۆی بهێنێو قەناعەت بە خۆی بکات، کە کەسانێك ڕێزو حورمەتی خواو پێغەمبەرﷺ و قورئان و ئایینەکەی ناگرن، بەدڵسۆزو جێگای ئومێدو متمانەی خۆییان بزانێ، دیارە کۆمەڵگای کوردەواریشمان – سوپاس بۆ خوا – هێندە هۆشیارو بێدار بۆتەوە کە بەو جۆرە فێڵە سادەو سەرکێڵانە لەخشتە نەچێو چاوبەستی لێ نەکرێ!

## ٧– پەرچ و لەمپەر خستنە ڕێی کاروانی بێداریو هۆشیاری ئیسلامی چ دەگەیەنێ؟!

شتێکی ڕوونە کە خۆشەویست ترین و پیرۆزترین شتی هەر گەل و کۆمەڵێك ئایین و بیرو باوەڕەکەیەتی، کەواتە کەسێك بیەوێ بەدڵسۆزو مشوورخۆری گەل و کۆمەڵەکەی حیساب بکرێ دەبێ ڕێزو تەقدیری تەواوی بۆ ئایین و بیروباوەڕی میللەتەکەی هەبێو نەك هەر دژایەتی نەکات و بەوەی کە گەنج و لاوی تازە پێگەیشتووی کۆمەڵگایەکەی لەو ئایینە کۆ دەبنەوەو دەوری دەدەن و خزمەتی دەکەن، نەك هەر قەڵس و سەغڵەت نەبێو پێی ناخۆش نەبێ! بەڵکو دەبێ هەوڵ و تەقەلاّی جیددیش بدات بۆ زیاترو چاکتر چەسپاندن و پەرەستاندن و گەشەکردنی ئەو ئایین و بیروباوەڕە لەنێو گەلەکەیدا. ئینجا بەتایبەتیش ئەگەر ئەو ئایینە ئیسلام بێت، کە دوایین نوسخەی هیدایەتی شیفابەخشی خوایە بۆ مرۆڤایەتی ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ یونس (٥٧).

باشە گەل و میللەتی بێدین و بێعەقیدە چ خێرێکی لێ چاوەڕوان دەکرێو کام سەنگەرەی خەبات و بەرەنگاری پێ دەگیرێ! ئایا هەموومان نەمان بینیوە چۆن ئینسانی بێ عەقیدەو بێ (قیم) خۆیو گەل و نیشتیمانیشی هەرزان فرۆش دەکات و، بە تۆزە ڕابواردنێکی خۆیو بەرژەوەندییەکی شەخسیی خۆییان لەدات!

کەوابێ: ئایا ڕێگا تەنگ کردنەوەو گرتن لە گەنج و لاوەکانی کورد کە فێری قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ و یاساکانی شەرع و ئاداب و ڕەوشتی ئیسلامی بن، لە ڕێگای مزگەوت

داخستن و تۆمەت و قسەو قسەلۆك بەدوا خستن و فشار خستنەسەری جۆراو جۆرەوە لەلایەن حیزبە لائیکە حوکمڕانەکانی کوردستانەوە چ دەگەیەنێ؟!

پێم وایە وەڵامی ئەم پرسیارە هێندە ئاشکرایە پێویست بە نووسین ناکات، بەڵام جێی خۆیەتی لێرەدا ئامۆژگاری‌یەکی دڵسۆزانە ئاڕاستەی ئەو جۆرە برادەرە عەلمانی‌یانە بکەین کە بە قەڵەبالغ بوونی مزگەوتەکان بە کوڕو کچی کوردو دەرس خوێندن و شارەزابوون و پەروەردە بوونیان لە قوتابخانەی قورئاندا کێچیان دەکەوێتە کەوڵ و قەڵس دەبن و هاوسەنگی (توازن)ی دەروونی‌و عەقڵی خۆیان لەدەست دەدەن و قسەوباس و پڕوپاگەندەی سەیرو سەمەرە دەکەن:

هۆ برادەرینە! هەمووتان دەزانن و ئاگادارن کە ئێوەی سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیری کورد! بە پەنابردنتان بۆ ڕێچکەو بیردۆزەکان -کە عەلمانیەت هەموویان کۆ دەکاتەوە- و دەست بەرداربوونتان لە ئیسلام وەك عەقیدەو بەرنامەی ژیان و گوزەران بە پێ لێنانی خۆتان، لەڕووی دینداری‌و مسوڵمانەتی‌یەوە -مەگەر لەلای خەڵکی سادەو بێ ئاگا ئەگەر نا- (مصداقیة)ی خۆتان لەدەست داوەو بەشتان بە هیچەوە نەماوە[1]، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿ومن يبتغ غير الإسلام ديناً فلن يُقبَلَ منه وَهُوَ فِي الآخرة مِنَ الخاسرين﴾ آل عمران (٨٥)، واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دیکە بخوازێ لێی قبووڵ ناکرێ‌و ئەو کەسە لە دواڕۆژیش دا لە زیانبارانە، دەجا ئێوەش بە ئاشکراو بێ پێچ و پەناو پڕ بەزارتان دەڵێن: (ئێمە عەلمانین) وە ئەسڵەن ئەگەر یەکێك لێتان بپرسێ کە ئایا ئێوە (ئیسلامی)ین و بڕواتان بە ئیسلام هەیە کە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان و گوزەرانتان بێت؟! ئەوە بێگومان (ئیسلامی بوون) بە تۆمەت و بوختانێك دەزانن کە پێتان کراوەو هەر زوو وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: نەخێر کاکە ئێمە ئیسلامی نین!

---

(١) دیارە ئەمە حوکمێکی گشتی‌یەو بۆ چەسپاندنی لەسەر تاکەکان(افراد) پێویستی بە سەرنج دان و لێکۆڵینەوە دەکات تاکو بزانرێ ئایا شارەزایانی شەرع (الفقهاء) دەڵێن: (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) بووە، واتە (مەرجەکانی کافربوون هاتوونە دی‌و پەرچەکانی لاچوو ون) یان نا، جا هەر کەسێك مەرجەکانی کافربوونی تێدا هاتبنە دی، هیچ بەرپەرچ (مانع)یش نەبن وەك: تۆبزی لێ کردن (الاكراه)و نەزانی (الجهل)، ئەوە حوکمی کافر بوونی بەسەردا دەدرێ ئەگەرنا نا.

جا برادەرینە ئامۆژگاری یەکەم ئەوەیە کە مادام بەهۆی ڕەفزکردنی ئیسلامەوە -کە خوا فەرمووی‌یەتی بەرنامەیەکی تێروتەواوەو پەڵەی تێدانیە ﴿..اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام ديناً..﴾ المائدة (٣)، خۆتان لەبازنەی ئیسلامەتی بردۆتە دەرێو چوونەتە جوغزێکی دیکەو ژێر ئاڵایەکی دیکەوە، بۆ ئەوەی لەبازنەی کوردایەتی‌و نیشتیمان دۆستی‌و نەتەوە پەروەریش نەچنە دەرێو لێتان بسەلمێنرێو بڕواتان پێ‌بکرێ کە دڵسۆزو خەمخۆری کوردو کوردستانن لەبەرانبەر خۆشەویست ترین و پیرۆزترین و چاکترین و بەرزترین شتدا کە گەلی کورد هەیەتی، کە ئاین و بیروباوەڕەکەیەتی هەڵوێست و ڕەفتاری خۆتان بگۆڕن و چی‌تر ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ تەقە لە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام مەکەن و، کۆسپ و پەرچ لەڕێی دینداری‌و مسوڵمانەتی‌دا دروست مەکەن و، کە ئیسلامەتی‌یەکەشتان دۆڕاندوەو لەدەست داوە، با ئەوەندە کوردایەتی‌و نیشتیمان پەروەرێتی‌یەی کە لەئاکامی شەڕی نێوخۆوە بۆتان ماوەتەوە لەدەستی نەدەن و شتێکتان هەر بەدەستەوە بمێنێ، قەتیش خەیاڵ پڵاوی وا مەکەن کە ئەو گەل و جەماوەرەی دژایەتی ئاین و عەقیدەکەی دەکەن و پەرچ و لەمپەر لەڕێی دینداری‌و مسوڵمانەتی‌یەکەی‌دا دروست دەکەن، هێندە سادەو ناحاڵی بێت هەر گوێ بۆ قسەو وتارتان بگرێو سەرنجی هەڵوێست و پەرێزو ڕەفتارتان نەدات!

بەڵێ! قەناعەت مەکەن خەڵکی مسوڵمانی کورد بڕوای بە دڵسۆزی‌و کوردایەتی کردن و نیشتیمان پەروەرێتی کەس و کۆمەڵێک هەبێ کە بە گەشەکردن و بەرەو پێش چوونی ئایینەکەی قەڵس و سەغڵەتەو، ڕێگای دینداری کردنی پێ‌نادات مەگەر لەو سنوورو جوغزەدا کە زیانی بۆ پەزەکانی نەبێ[1]! چونکە دین (ئیسلام) هاتوە (حاکم) بێت نەک (محکوم)و خەڵک ئیزن و ئیجازەی کارو ڕەفتار لەم وەربگرێ نەک ئەم لە خەڵکی‌و بیرەدۆزەو ڕێچکەکانیان، وەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿..فَاحكُم بَينَهُم بما انزل اللهُ ولا تتبع اهواءهم عما جاءكَ مِنَ

---

(١) دەگێڕنەوە ساڵێکیان مەلایەک بۆ مەلایەتی دەچێ بۆ ناوچەیەک کە خەڵکێکی ڕەوەندو مەڕداری لێ دەبێ‌و تا ئەو کاتەش مەلایان نەبووە، جا لە کاتێکدا کە مەلا بانگ دەدات یەکێکیان بانگی ئەوی دیکەیان دەکات کە لە نزیک مەلایەکەوەیەو دەڵێ: ئەوە ئەو دەنگە دەنگە چی‌یە لالۆ؟! ئەویش دەڵێ ئەوە مەلایە بانگ دەدات، کابرا دەڵێ جا ئایا ئەو بانگە زەرەری بۆ پەزەکان (مەڕەکان) نیە؟! دەڵێ: نەخێر، دەڵێ کەواتە لێ گەڕێ با بیڵێ.

الحق... ﴾ المائدة(٤٨)، واتە: وەبەرەی خوا ناردوویەتە خوارێ حوکمیان لەنێوەندا بکە و مەکەوە شوێن ئارەزووەکانیان و لەو هەقەی بۆت هاتوە لامەدە!

## ٨- بیانووگرتن بە گەنج و لاوە ئیسلامی یەکان و دروست کردنی کێشەو مشت و مڕی لابەلا:

لەم رۆژانەدا زۆر جاران دەبینین و دەبیستین کە لەسەر باسکردنی هەندێك مەسەلەو بابەتی عەقیدەیی و فیقهی لەلایەن گەنج و لاوەکانەوە لەلایەن هەندێك مەلاو شێخی ناحاڵی یان دەست لەپشتێ دراوو هاندراوەوە هەراو کێشەو دەمەقاڵێ و مشت و مڕی زۆر بەرپا دەکرێ، شین و واوەیلا بۆ ئیسلام ساز دەکرێ وەك ئەوەی ئیسلامەتی هیچ دەردو کێشەیەکی نەبێ و هیچ بەڵاو گرفتاری یەکی بەسەر نەهاتبێ جگە لە باسکردنی ئەو جۆرە مەسەلانە لەلایەن وەچەی نوێ (الجیل الجدید)ی بێداری ئیسلامی یەوە!

جا ئەگەر گریمان ئەو باس و بابەتانە بە بۆچوونی هەندێك لە مەلاو شەرعزانەکان هەڵەش بن، یان هەر لەڕاستیدا شایانی باسیش نەبن لەو کات و شوێن و حاڵەداو شتی لەوان پێویست تر هەبێ، یان بە ناشیی یی و بێ حیکمەتی بخرێنە ڕوو، وەك بەندە زۆر تێبینی و ڕەخنەم لەو بوارەدا بە گوتن و نووسین ئاڕاستەی ئەو جۆرە برایانە کردوەو ئامۆژگاریم کردوون[1]، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو جۆرە مەسەلانە دروست نیەو ماقووڵ نیە بکرێنە مایەی بیانوو گرتن بەو قوتابی و گەنج و لاوانەو دەستە چیلەی هێرش بردنە سەریان و ناو زڕاندنیان و، پاشانیش بەرۆك پێگرتن و ڕێگا لێ گرتنیان، کە هەر ئەمەی دواییش هاندەری ئەسڵی و (بیت القصید)ی دروست کردنی ئەو قاڵ و باس و مشت و مڕو هەرایە سەیرو ناماقووڵەیە!

بەڵێ! ئەو هەراو هۆریاو قاڵ و باس دروست کردنە لە لایەن عەلمانی یەکان و دەست و پێوەندەکانەوە لەدژی وەچەی تازەی بێداری ئیسلامی کوردستان درووست و ماقووڵ نیە چونکە:

(١) بۆ وێنە سەرنجی کتێبی (چەند ڕێنوێنی یەك بۆ ئیسلامی یەکانی کوردستان) بدە، هەروەها نامیلکەی: (بزووتنەوەی ئیسلامی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون).

**یەکەم:**

هەر کەسێك تەنانەت سەرەدەرێك لە قورئان و سوننەت و کەلەپووری هەمە لایەنەو دەوڵەمەندی ئیسلامی بکات تێ دەگات و دڵنیا دەبێ کەزانار پێشەوایانمان جیاوازی (خلاف)و مشت ومڕی زۆریان لە بەین دا بووە لەسەر ورتە بابەتەکان بەتایبەت لە بواری فیقهی‌دا، هیچ کامیشیان بەهۆی جیاوازی بیروبۆچوون (اختلاف الرأي)ەوە لەو بوارو بابەتانەدا کە جیاوازی تێیاندا سروشتی‌و ئاسایی‌یە یەکتریان تۆمەتبار نەکردوەو، (شافیعی) ڕەحمەتی خوای لێ‌بێ گوتەنی: (رايي صواب يحتمل الخطأ ورأي غيري خطأ يحتمل الصواب).

**دووەم:**

هیچ کەس ناتوانێ نکوولی لەوە بکات کە کۆمەڵگای کوردەواری ئێمەش وەك باقی کۆمەڵگایەکانی جیهانی ئیسلامی لەمێژە گیرۆدەی جۆرەها بیروبۆچوون و هەڵس و کەوت و ڕەفتاری هەڵەو ناشەرعی بووە لەهەموو بوارەکانی بیروباوەڕو عیبادەت و کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی‌و سیاسی‌و... هتد، کە بێگومان لەسەر هەموو لایەکمان پێویستە کە کۆمەڵگایەکەی لێیان بژار بکات و پاکی بکاتەوە، جا دیارە هەندێك کەسیش بەپێی دەستووری (خووی شیری هەتا پیری)و بەپێی یاسای هەڵەی مەلای مەزبوورە (پیاو ئەو پیاوەیە لەقسەی خۆی دانەبەزێ)، ڕەفتار دەکات و ئەو بیروبۆچوون و هەڵس و کەوتانەی کەخووی پێوە گرتوون و لە باب و باپیرانی‌یەوە بۆی بەجێ‌ماون و فرچکی پێوە گرتوون هەرچەندە بە بەڵگەی بێ پێچ و پەنای شەرعیش بۆی بسەلمێنی کە ئەو شتانە (شرك)و (بدعة)و (ئەفسانە)ن، یان خوو و خدەو داب و نەریتی کافرو دیانەکانن، دەست بەرداریان نابێ‌و وەك عادەتی بت پەرست و سەر لێ شێواوەکانی سەردەمی پێغەمبەرﷺ بەزمانی‌حاڵ -ئەگەر بە گوتاریش نەبێ- دەڵێ: ﴿إنا وجدنا آباءنا على امة وإنا على آثارهم مقتدون﴾ الزخرف (٢٣).

ئاشکراشە کە لە حاڵەتێکی ئاوادا تێك گیران و مشت و مڕ دروست دەبێ‌و، هیچ کەسیش بۆی نیە تەفسیری هەڵەو تۆمەتدار لەسەر ئەم حاڵەتە بکات و، ئەگەر واش بکات دیارە بێ‌ویژدانی‌یەو مەبەستی خراپ و پیسی هەیە.

## سێیەم:

بۆ دادوەری کردن و هەڵبڕینی کێشەو مشت ومڕی لەم بابەتەش کە باسکرا بێجگە لەزاناو شەرعزانان هیچ کەسی دیکە مافی دەست تێوەردان و خۆ تێ هەڵقورتاندنی نیەو، دەبێ زانایانی لێکۆڵەرەوەو ڕۆچوو و دڵسۆز ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرن و بۆ دیاری کردنی ڕاست و چەوت یان بەهێزو بێهێز (الراجح والمرجوح) لەنێو بیروڕاو بۆچوونەکان دا نوختە لەسەر حەرف دابنێن، نەك بابایەکی سیاسی کۆڵەوارو نەشارەزا بە ئایین، هەر لەبەر ئەوەی تەنها بەرپرسێکە بێت خۆی بکاتە (مامۆتك)و لە دیزەی فتواداندا بە ناهەق خۆی بکاتە ئەسکوێ! ئاخر ئێمە مادام لەهەموو بوارێکدا ڕێزو تەقدیرمان هەیە بۆ خەڵکی پسپۆڕ (اهل الاختصاص) بۆچی دەبێ لە مەسەلەی هەڵس و کەوت لەگەڵ بەرنامەی خواو زانیاریی‌یە شەرعی‌یەکان (العلوم الشرعية)شدا کە لەهەموو شتێکی‌تر پتر پێویستی‌یان بە شارەزایی‌و قووڵ بوونەوەو پسپۆڕی هەیە، هەروا نەکەین!!

## چوارەم:

دیارە ئەوەی گوتراش پاساو (مبرر) نیە بۆ گەلێك هەڵس وکەوت و قسەو ڕەفتاری ناشیاوی ئەو لاوانەی زۆر لە گەنج و لاوە دڵگەرم و بێئەزموون و کەم شارەزایەکان، کە هەر بەخوێندنەوەی نامیلکەیەك یان لەبەرکردنی چەند ئایەت و فەرموودەیەك وادەزانن چوونەتە ڕیزی زاناو پێشەوایانی پایە بەرزەوەو دەست دەکەن بە قسەی زل زل و ڕەخنە لەم و لەو گرتن و فتوادان و بێڕێزی نواندن سەبارەت بە زاناو پێشەوایانی ڕەسەنمان. کە ڕەنگە زۆر لەو گەنج و لاوانە جارێ هەر نەگەیشتبنە ئاستێك بتوانن کتێب و بەرهەمەکانشیان بخوێننەوەو تێیان بگەن.

بەلام مەسەلەی بیانوو پێگرتن و تێهەڵپێچان شتێکی تەرەو نابێ تێکەڵ بکرێن، چونکە تێکەڵ کردنی هەق و ناهەق عادەتی جوولەکەکانە، کە بەمەستی شێواندنی هەق، یان ڕەواج پێدانی (باطل)و ساغ کردنەوەی بە ناوی هەقەوە، تێکەڵیان دەکردن وەك خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی ﴿یا اهل الکتاب لم تلبسون الحق بالباطل وتکتمون الحق وانتم تعلمون!﴾ آل عمران (٧١).

## ٩- ئیسلامی‌یەکان و تۆمەتی ڕەشەکوژی (تیرۆر):

ماوەیەکە هەندێك لە علمانی‌یەکانی کوردستان تووتی ئاسا بەلاسایی کردنەوەی دامو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواو ڕژێمە کافرە داپلۆسێنەرەکانی جیهانی ئیسلامی لە عارەب و تورك و غەیری ئەوانیش، هەر لەخۆوە دەستیان کردووە بە بلاوکردنەوەی پروپاگەندەو قسەوقسەلۆکی بێ‌جێو بێ‌بنچینە لەدژی ئیسلامی‌یەکان و تۆمەتبار کردنیان بە ڕەشەکوژی‌و تیرۆرو لە هەمووشی سەیرو سەمەرەتر (دژی ئافرەت بوون)!!

لەحالێکدا کە ئیسلامی‌یەکان حوکمڕان و دەسەلاتدار نین هەتا بتوانن و بە ئەرکی سەرشانی خۆشیانی بزانن کە یاسا شەرعی‌یەکان (الاحکام الشرعیة) لە ولاتدا بچەسپێنن، کە بەشێك لەو یاسا شەرعی‌یانە ئەو (حدود)و سزایانەن کە ئیسلام بەمەبەستی پارێزگاری لەعەقیدەو ژیان و عەقڵ و وەچەو ئابڕوو و سامان ( الدین والحیاة والعقل والنسل والعرض والمال)ی کۆمەڵگا دایناون و جێ‌بەجێ کردنیشیانی هەر حەوالەی کۆمەڵگای مسولمان و دەسەلاتە شەرعی (السلطة الشرعیة)یەکەی کردوە، کە ئەمانەن:

١- سزای پاشگەزبوونەوە لە ئاین (عقوبة الردة).

٢- سزای کوشتنی بە ناهەق (کە چەند جۆرێکەو سزایەکەشیان جۆراو جۆرە).

٣- سزای مەیخۆری‌و خواردن و خواردنەوەی هەر شتێکی عەقڵ لابەر.

٤- سزای داوێن پیسی (زیناو نێربازی).

٥- سزای بوختان پێکردن (القذف) (واتە تۆمەتبارکردنی یەکێك بە داوێن پیسی بە بێ بەلگەو ئیسپاتی شەرعی‌ی تەواو).

٦- سزای دزی‌و جەردەیی‌و ڕێگری.

جا لێرەدا بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژی ئەو تۆمەت و گومانانە خستنە ڕووی چەند ڕاستی‌یەك بە پێویست دەزانم:

**یەك:**

شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە جێ‌بەجێ‌کردن (تنفیذ)ی سزا شەرعی‌یەکان لەئەستۆی دەسەلاتی شەرعی (السلطة الشرعیة) دایەو هەر کەسە لەبەرە خۆیەوە بۆی نیە بەو کارە هەڵسێ، چونکە لە ئاکامی ئەمەدا ئاژاوەو پەشێوی‌و ئالۆزی پەیدا دەبێت و هەق و ناهەقیش تێکەڵ دەبێ، دیارە

شەرعیش ڕێگا بەشتی وا نادات، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵگار کیانی سیاسی ئیسلامییش کە ویلایەت و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر تاکەکانی خۆی‌دا هەیە، یەکسەر لە جێبەجێکردنی (حدود)و سزا شەرعی‌یەکانەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو لە تێگەیاندن و پەروەردەکردنی تاکەکانی کۆمەڵگاو چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانیان و دابین کردنی مافەکانیانەوە دەست بەکار دەبێت، ئینجا پاشان هەر کەسێك لای‌داو بەبێ عوزرو بیانوو خەتی خوار کرد ڕاست دەکرێتەوەو سزای پڕ بە پێست و دادگەرانە دەدرێ، کە بێگومان ئەو ڕاست کردنەوەو سزادانەش هەر لەپێناوی بەختەوەری‌و سەلامەتی کۆمەڵگاو پاراستنی دایە.

سیرەو ژیانی پێغەمبەرﷺ ی پێشەوامان و، جێبەجێ نەکردنی زۆر لە سزایەکانیش لە حاڵەتە نائاسایی‌یەکانی وەك: نەزانی (الجهل)، تۆبزی لێکران (اکراه)، ناچاری‌و تێگیران (اضطرار)، بالغ نەبوون، شێتی... کە بەدرێژی لە کتێبە شەرعی‌یەکاندا قسەیان لەسەر کراوەو توێژراونەوە باشترین بەڵگەی ئیسپاتی ڕاستی ئەو قسەیەمانە.

دوو:

فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)یش کە بە ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانان دانراوە بە نێرو مێ‌و وردو درشتەوە هەر کەسە بەپێی تواناو بۆلوانی، زۆر جیایە لە جێبەجێکردنی (حدود)و سزاشەرعی‌یەکان، هەرچەندە زۆر لە نەشارەزایان بە ئیسلام- بەتایبەت عەلمانی‌یەکان- لێیان تێکەڵ دەبن و هەر لەئەنجامی ئەمەشدا دووچاری حوکم و بۆچوونی هەڵەو سەیر دەبن، بۆ وێنە: کە دەبیستن مەلایەك یان هەر مسوڵمانێکی‌تر لەسەر مینبەر یان لەکاتی دەرسدا ئامۆژگاری مسوڵمانان دەکات و هانیان دەدات کە لەبەرانبەر کوفرو زوڵم و فەساددا ڕابوەستن و قبووڵ نەکەن و... هتد ئەوەی زاناو شارەزابێ دەزانێ کە ئەوە بانگەوازەو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەیە، بەڵام ئەوەی نەزان و بێ ئاگا یان زۆرزان و لە بەهانە بێت پێی وایەو دەڵێ: ئەوە فتوادانەو فەرمان کردنە بەگرتن و کوشتن وبڕین!!

سێ:

دیارە ئیسلامی‌یەکان و هەموو ئینسانێکی دیکەش لەکاتی زوڵم و دەستدرێژی کرانەسەردا جا بە ئاشکراو سەنگەر لێگرتن بێت، یان بەپەنهانی‌و ڕەشەکوژی‌و پیلان، دەست کردنەوەو

بەرپەرچدانەوەو بەرگری لە خۆکردن بەمافێکی سروشتیی و هەقێکی شەرعی خۆیان دەزانن، بەهەر شێوازێك بۆیان بلوێ، جا ئایا بۆیان دەکرێ و دەتوانن ئەو بەرگرییە لەخۆیان بکەن یان نا، ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، خوای پەروەردگارمان لەو بارەیەوە فەرموویەتیو فەرمانیشی پێکردووین: ﴿..فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بِمِثْلِ مااعتدى عَلَيكُم..﴾ البقرة (١٩٤)، بەڵێ ئەوەی ڕەشەکوژمان بکات هەقی خۆمانە تۆڵەی لێبستێنین و، ئەوەی سەنگەرمان لێبگرێ مەگەر هەر توانامان نەبێ ئەگەرنا دروست نیە ملی بۆ کەچ بکەین و دەبێ لە سنووری خۆیدا ڕای بگرین و بەڵکو پێویستە ئەو سەریشی لێ بگرین و وای لێ بکەین توانای ستەم و دەستدرێژیو چەوساندنەوەی بڕوادارانی نەمێنیو یان مسوڵمان بێ، یان دان بەسەروەریتی ئیسلامدا بهێنێ، وەك خوای دادگەرو میهرەبان فەرموویەتی: ﴿وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين لله فإن انتهوا فلا عدوان إلا على الظالمين﴾ البقرة (١٩٣)، واتە: وەلەگەڵیان بجەنگن هەتا (کافرەکان توانای) ئەشکەنجەو ئازار (دانی مسوڵمانانیان) نامێنێ، وە گەردن کەچی بەس بۆ خوا دەبێ، جا ئەگەر دەستیان هەڵگرت (لەدژایەتی ئیسلام و مسوڵمانان) ئەوە دەستدرێژی بەس دەکرێتە سەر ستەمکاران.

بە کورتی: مسوڵمانان دەبێ هەوڵ بدەن دوژمنەکانیان وا لێ بکەن یان بەویستی ئازادو قەناعەتی خۆیان بڕوا بێنن و مسوڵمان ببن، یان ئەگەر مسوڵمانیش نەبن و لەسەر بیروباوەڕی خۆیان بمێننەوە توانای دژایەتی ئیسلام و ئازاردانی مسوڵمانانیان نەمێنیو مەبەستیش لە ﴿حتى لاتكون فتنة ويكون الدين لله﴾ هەر ئەمەیە نەك وەك هەندێك کەس بە هەڵە حاڵی بوون و پێیان وایە مەبەست لەم ئایەتە بەتۆبزی مسوڵمان کردن و باوەڕهێنانی کافرانە، کە بێگومان ئەمە شەرعیو واقیعی نیە، چونکە بڕواو قەناعەت بە زۆرە ملیو ناچاری دروست نابێو، پێچەوانەی ئایەتی ﴿لا إكراه في الدين..﴾ البقرة (٢٥٦)، و ئایەتی ﴿..فمن شاء فليؤمن ومن شاء فَلْيَكفر..﴾ الكهف (٢٩) یش و چەندان ئایەتی دیکەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەریشە ﷺ.

## چوار:

دیارە لایەنە ئیسلامییەکان بەرپرسیار نین لەهەڵس و کەوت (تصرف)ی عاتیفیو تاکڕەوانەی مسوڵمانێك کە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی کارێکی وەك هەڕەشەو کوشتن یان

تەقاندنەوەی شوێنێکی فەساد بەبێ ئاگاداریو پرس و ڕاوێژ کردن بەسەرووی، خۆی، هەڵبەتە دواییش نابێ لەسەری هەڵبداتێو بەرگری لێ بکات.

پێنج:

جنێودان و قسەی سووك و ناشیرین گوتن بەخواو پێغەمبەرﷺو قورئان و شەرع و مەلاو مزگەوت و مسوڵمانان و ئیهانە پێکردنیان، وەك هەندێك بێدین و زەندیق و ڕەوشت نزمی ترسنۆك دەیکەن، شتێکە بەهیچ کەس کە هەر تۆزێك مسوڵمان بێت قبووڵ ناکرێو، هەقی بەرپەرچ دانەوەی ئەو قسەو ڕەفتارانە ئی هەموو مسوڵمانێکەو هەر کەسە لەڕاست خۆیەوە بەهەر شێوەیەکی شەرعی کەبۆی دەرەخسێ بۆی هەیەو بگرە لەسەری پێویستە ئەو جنێوفرۆش و دەم شڕانە دەمکوت و بێ دەنگ بکات، دیارە هەر کەسێکیش لەسەر ئەو جنێوفرۆشە دەم شڕو بێباوەڕو چەقاوەسووانە وەجواب بێت و بەرگرییان لێبکات تاوانبارەو خۆی تۆمەتبارو عەیبدار کردوە!

بەڵێ! مسوڵمانان بەدەقی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ هەتا خواو پێغەمبەرەکەییان لەخۆیان و باب و دایك و ڕۆڵەیان خۆشتر نەوێ بە بڕوادار حیساب ناکرێن، خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ومن الناس من يتخذ من دون الله انداداً يحبونهم كحب الله والذين آمنوا اشد حباً لله...﴾ البقرة (١٦٥)، واتە: وەخەڵکی وا هەیە کە لەجیاتی خوا چەند هاوبەشێك پەیدا دەکەن و وەك خۆشویستنی خوا خۆشیان دەوێن، بەلاّم ئەوانەی بڕوایان هێناوە خۆشەویستییان بۆ خوا زیاترە -لە خۆشەویستی ئەوان بۆ پەرستراوەکانیان-.

پێغەمبەری خواشﷺ فەرموویەتی: (لايؤمن احدكم حتى يكون الله ورسولة أحب اليه مما سواهما..) متفق عليه، واتە: یەکێك لەئێوە بڕوا ناهێنێ هەتا خواو پێغەمبەرەکەی لە غەیری ئەوان لەلا خۆشەویست تر نەبن، دیسان فەرموویەتی: (لايؤمن احدكم حتى اكون أحب إليه من والده وولده والناس اجمعين) رواه البخاري، جا ئایا چ مسوڵمانێك کە تۆزە غیرەت و جورئەتێکی هەبێ لەکەسێك دەبووریو قبووڵ دەکات کەجنێو بەخۆی یان باب و دایکی یان هاوسەری بدات و ئیهانەیان پێبکات؟!

دە جا مادام خواو پێغەمبەریشمان لەخۆمان و باب و دایك و سەرجەم كەس و كارمان لەلا بەرێزترو خۆشەویست تر بن دیارە حەوجار حەوجار نابێ بەهیچ ڕەنگێك لە هیچ كەسێك قبووڵ بكەین جنێویان پێ بڵێو سووكایەتی‌یان پێ بكات!

**شەش :**

لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە كە ئەو هەرچیوپەرچی جنێوفرۆش و دەم شڕانە ئەهلی ئیسلام بەگشتی بەوە تاوانبار دەكەن كە ئافرەتیان خۆش ناوێو ڕێزی لێناگرن و دەیچەوسێننەوەو زۆری‌تر لەم قسە بێ سەروپێو لاف و گەزافە بێ بنچینانە، جا بەڕاستی من كە ئەو قسە قسەلۆكانەی ئەو دەستەو تاقمانە دەبیستم یەكسەر ئەو پەندە كوردی‌یەم دێتەوە یاد كە دەڵێ: (هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت!)، ئاخر بەڕاستی سەیرە! دەستەو بەستەیەكی زەندیق و بێ ڕەوشت كە داوای بەرەڵدایی جینسی (الاباحة الجنسية)و تێكەڵاوی جینسی (الشيوعية الجنسية) دەكەن و پڕ بەزاریان دەڵێن و دەیڵێنەوە كە نابێ خێزان و ژن و مێردایەتی هەبێو دەبێ ئافرەت ئازاد بێ -هەروەها پیاویش- كە كەیو چۆن و لە كوێو لەگەڵ كێ غەریزەی جینسی خۆی تێر دەكات و یان بەزاراوی ئەوان (مومارەسەی جینس دەكات)! بەڵێ دەستەو بەستەیەكی ئاوا خۆیان بە پارێزەری مافی ئافرەت و بەرگری لێكەری بزانن و، ئەهلی ئیسلامیش هەر لەبەر ئەوەی بەپێی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ هەڵس و كەوت دەكەن و دەڵێن دەبێ ئافرەت بەحەیاو حەشمەت و پۆشتەو پەرداخ بێت و، وەك باخی پەرژین كراو جگە لەخاوەنی حەڵاڵی خۆی كە مێردیەتی كەسی دیكە دەستی نەگەیەنێتیو نەبێتە پەشتەماڵ و هەر جارەی بەدەست داوێن پیسێكی ڕەوشت نزمەوە بێ! وە هەر لەبەر ئەوەی دەڵێن: ئافرەت دەبێ بە شێوەیەك هەڵس و كەوت بكات لە كۆمەڵگادا كەوەك (ئینسان)ێكی بەرپرس و خاوەن ئەرك و كار بێتە بەرچاو نەك وەك (مێیینە)یەكی سەرنج ڕاكێشەرو داماوو فەوتاوو بێ‌بەندوبار!

وەهەروەها لەبەر ئەوەی دەڵێن: هەر كام لەپیاوو ئافرەت چ لەڕووی جەستەیی‌و چ دەروونی‌یەوە لە یەك جیان و هەر كامێكیان بە شێوەیەك دروست كراوەو هەڵخراوە كە بشێ بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرك و كارەی كە سروشتی خۆی داخوازی دەكات و كۆمەڵگاش پێویستیەتی‌و، هەرچەندە لەئیمان و تاعەت و ئینسانەتی‌و زۆربەی ماف و ئەركەكانیاندا وەك یەك و یەكسانن، بەڵام هەر كامێكیشیان هەندێك ئەرك و كارو مافی تایبەت بەخۆیشی هەیە!

... بەڵێ! ئەو دەستەو تاقمە هەر لەبەر ئەمانە کە فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ و پێداویستی ژیان و هەڵقوڵاوی سروشتی ئینسانن ئەهلی ئیسلام بە گشتیو ئیسلامی یەکان بە تایبەت بە داپڵۆسێنەرو زەوتکەری ئافرەت و ڕەجعیو نامووس پەرست و چیو چی دەزانن!

ئایا ئەو سەرگەردان و ڕەوشت نزمانە هیوای ئەوەیان هەیە بەم جۆرە بیرکردنەوەو ڕەفتارو هەڵوێستەیانەوە لە کۆمەڵگای کوردەواری هەر جێگاشیان بێتەوە چ جای کۆمەڵگای کوردەواری بە بیری پڕیوو ڕەوشتی گەنیویان پیس و پۆخەڵ بکەن! ئەگەر خولیاو ئاواتی ئاوایان لەدڵ و مێشك دایە ئەوە من دڵنیایان دەکەم کە ئەو خولیاو ئاواتانەیان لە کوردستان و غەیری کوردستانیش بۆ تەحقیق نابیٚ، هەتا زووە با بارگەو بنەیان بەرەو هەوای سروشتی خۆیان کە ڕۆژئاوای بێبڕواو ڕەوشت داڕووخاوە بپێچنەوەو چی دیکەش مسوڵمانانی ڕەوشت چاك و سروشت پاك بە بۆگەنی بیردۆزە ژەنگاوییو خوو و خدە گەندەڵەکانیان نارەحەت نەکەن و وایان لێ نەکەن چیتر تەحەممول نەکەن!

## ١٠- ئیسلامەتی ڕاستەقینە بەبێ خەڵکێکی ڕزگارو خاکێکی ئازاد بەڕێوە نابرێ:

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکانم!

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا وتو وێژێکی واقیعی یە کە لەساڵی (١٩٨١)ی زایینیدا، واتە (١٧) ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە، دیارە ئەو کاتیش بزووتنەوەی ئیسلامی ئاوا سەری هەڵنەدابوو و دەرنەکەوتبوو، کەواتە ئەوەی لەدەقی وتو وێژەکەدا هاتوە -کە لەم چاپی دووەمەشدا وەك خۆی بێ دەستکاری هێشتوومەتەوە- بیروبۆچوون و قەناعەتی بابایەکی کوردی مسوڵمان و ئیسلامییە لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتیو هیچ پەیوەندی بەمەسەلەی سیاسەت و حیزبایەتی یەوە نیە، ئەم ڕاستی یەشم بۆیە خستەڕوو چونکە زۆر کەس لە برادەرانی عەلمانی بەچاوی گومانەوەو لەپشت پەردەی تلخ و ڕەشەوە سەرجی ئیسلامی یەکانی کوردستان دەدەن و، گومان و دوودڵی یان هەیە سەبارەت بەنیشتیمان پەروەرییو گەل دۆستی یان! تەنانەت ئی وایان هەیە پێی وایە دینداریو نیشتیمان پەروەری، یان مسوڵمانەتیو کوردایەتی پێکەوە نەژو ناکۆکن و

ناکرێ ئینسان لەیەک کاتدا هەم مسوڵمانەتیش بکات و هەم کوردایەتیش و حەتمەن دەبێ یەکیان بەقوربانی ئەوی تریان بکات و دەست بەرداری بێت!

جا بۆیە بۆ تەئکید کردنەوەی ئەو ڕاستی‌یە کە ئێمەی ئیسلامی هیچ دژایەتی‌و پێکەوە نەگونجانێك لەنێوان مسوڵمانەتی‌و کوردایەتی -ئەگەر بریتی بێ لە خزمەت بە گەل و بەرگری لە وڵاتمان لەژێر ئاڵای ئیسلام دا- نابینین، بەڵکو بە دوو شتی پێکەوە پەیوەست و پێکەوە گرێ دراویان دەزانین، وە بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژی هەر گومان و تۆمەتێك و بەرچاو ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەو برادەرانەش لەو بارەوە ئەم چەند خاڵە زۆر بەکوشراوی دەنووسین:

**یەکەم:**

جگە لەم چەند ساڵەی دوایی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا بەدرێژایی ئەو خەباتە درێژخایەنە نەپساوەو شێلگیرە ئاڵا هەڵگرو سەرقافڵەی ئەو کاروانە بەبێ (استثناء) تێکڕا کەڵە پیاوانی دیندارو خواپەرستی وەك: شێخ عبیداللەو شێخ عبدالقادری شەمزینان و شێخ مەحمودی حەفیدو شێخ سەعیدو قازی موحەممەد... بوون و تەنانەت ئەوانەی دیکەش کەوەك پیاوی زاناو دیندار ناوبانگیان نەبووە، وەك: یەزدان شێرو سمایلخانی شکاك و مەلا مستەفا... هەر خۆیان بە مسوڵمان زانیوەو خەڵکیش وەك سەرکردەیەکی دیندارو مسوڵمان تەماشای کردوون و هەر ئەمەش گەورەترین هۆکارو نهێنی (سر)ی باوەڕو متمانەو گوێڕایەڵی‌و ڕێزی خەڵك و جەماوەری کورد بووە بۆیان.

جا ئەم واقیعە مێژوویی‌یە ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ئەو زاناو گەورە پیاوو سەرکردانە نەك هەر هەستیان بەناکۆکی نێوان مسوڵمانەتی‌و خەبات لەپێناوی لابردنی نیری چەوساندنەوەو زۆرداری لەسەر شانی گەلەکەیان نەکردوە، بەڵکو وەك ئەرك و پێویستی‌یەکی شەرعی‌یانەی سەرشانیان چاکی مەردایەتی‌یان لێ هەڵماڵیوەو چەکی خەبات و فیداکاری‌یان هەڵگرتوە، خوا لێیان خۆش بێ‌و پاداشتیان بداتەوە.

**دووەم:**

وا دیارە ئەو جۆرە کەسانەی ئاوا بیر دەکەنەوە (قیاسی کەشکێ لە مەشکێ) دەکەن و بە چاویلکەو لەپشت پەردەی ڕەش و لەدەلاقەی ئایینی گۆڕاو (محرف)ی مەسیحی‌یەتەوە سەیری ئیسلام دەکەن، خەیاڵیان وایەو وادەزانن کە دەگونجێ ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمان

بەبێ خەڵك و خاك دینداری بكات و ئیسلام لەژیانیدا پیادە بكات! بێخەبەر لەوەی كە ئەگەر بگونجێ ئایینی شێوێنراوی فەلەیی بناخنرێتە كونجی كڵێسایەكەوە، خەڵكی بەس بەبۆنەو موناسەبات و وەك تەقالیدێكی كۆمەڵگاو داب و نەریتێكی كۆنی باب و باپیران و پێشینانیان جاروبار (فەلە بوونی) خۆیان وەبیربێنەوە دەری بخەن، وەك ئێستا مەسیحییەكانی دنیا دەیكەن، ئیسلام كە سیاسەت و عیبادەت و حوكم و حیكمەت و ڕووح و جەستەو بازاڕو مزگەوت و دنیاو قیامەتە ئەستەم و مەحاڵە بەبێ تێگەیشتن و پێگەیشتن و خەملاندنی گەل و كۆمەڵگایەك و دابین كردن و ئازادكردنی نیشتیمان و جێگایەك، بلوێ پیادە بكرێو ئەرك و فەرمانە تاكیو كۆمەڵیو ڕووحیو سیاسیو دینیو مەدەنییەكانی جێبەجێ بكرێن.

بەڵێ! ئیسلام ئایین و بەرنامەی خوایە بۆ هیدایەت كردن و ڕێكخستنی ژیان و گوزەرانی تاك و كۆمەڵ و دەبێ بەویست و دەستی خەڵكێكی سەربەخۆو لەخاكێكی ئازاددا پیادە بكرێو، بەهیچ جۆرێك خوا ڕازی نابێ بەرنامەكەی لەسووچی مزگەوت بناخنرێو بوارو مەیدانەكانی دیكەی ژیانی وەك: پەروەردەو ڕۆشنبیریو سیاسەت و ئابووریو جەنگ و ئاشتیی لێ بگیرێ، چونكە خوای زاناو دادگەر فەرموویەتی ﴿هو الذی ارسل رسوله بالهُدی ودینِ الحق لیُظهِرَهُ علی الدین كله وكفی بالله شهیدا﴾ الفتح (٢٨)، واتە: -خوا- ئەو زاتەیە كە پێغەمبەرەكەی ﷺ بە هیدایەت و بەرنامەی ڕاستەوە ناردوە تاوەكو بەسەر هەموو بەرنامەكاندا سەری بخات، وە خواش بەسە بۆ شایەتی -ڕاستیو تەواویی بەرنامەكەی-.

**سێیەم:**

كەواتە ئەگەر خەڵكیدیكە بەس وەك هەست و ئەستێكی نەتەوەییو بەرژەوەندییەكی سیاسیو دنیایی بڕوای وایە كەدەبێ كوردیش وەك گەلانی دیكەی دنیا كیان و قەوارەی سیاسی خۆی هەبێو بەویستی خۆی لەسەر خاك و ئاوی خۆی بژیو هیچ كەس ستەمی لێ نەكات و نەیچەوسێنێتەوە مافە خوا پێدراوەكانی لێ زەوت نەكات، ئێمەی ئیسلامی بەر لەهەست و ئەستی نیشتیمان پەروەریمان كە بە غەریزەیەكی سروشتیو خەسڵەتێكی مسوڵمانەتیمانی دەزانین، وەك دینداریو عیبادەت و جێبەجێ كردنی ئەركێكی پیرۆزی خوایی سەرشانمان بەپێویستی دەزانین كردوكۆش بكەین بۆ ڕزگار كردنی خەڵكمان و ئازادكردنی خاكمان، چونكە وەك پێشتر گوتمان بەبێ خاكێكی ئازادو گەلێكی ڕزگارو سەربەخۆ دینداریو

مسوڵمانەتی ڕاستەقینەو بەمەعنای فراوانی وشە ناکرێو دەستوورو یاساکانی بەرنامەی خوامان بۆ جێبەجێ ناکرێن، ئینجا بەپێی یاسای شەرعی (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)، دیارە هەرچی دینداری کردنمان و مسوڵمانەتی کردنمان پەکی لەسەری بکەوێ ئەریش پێویست دەبێ!

دیارە ئەگەر وەك برادەرانی لائیك گومان دەبەن، ئیسلامیش وەك ئایینی گۆڕاوی مەسیحی بەس هەندێك دروشم و هەڵس و کەوت و مەراسیمی شەخصی بووایە بێگومان دەگونجا کە بەس لەماڵێو مزگەوتێو بگرە لە چوار چێوەی حەپسخانەیەکیش دا پیادە بکرێ، بەڵام ئیسلامێك کەرازی نەبووەو نابێ نە لەبواری عیبادەت و نە لەبواری حوکم و سیاسەتدا هاوبەش بۆ خوا دابنرێ، وەك فەرموویەتی ﴿فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملاً صالحاً ولا يشرك بعبادة ربه أحداً﴾ الكهف (١١٠)، وە فەرموویەتی ﴿..ولا يشرك في حكمه أحداً﴾ الكهف (٢٦)، واتە: وە -خوا- هیچ کەس لە فەرمانڕەوایەتیو حوکمڕانی خۆیدا ناکاتە هاوبەش. وە ئیسلامێك کە سوجدە بۆ صەنەم بردن و یاساو حوکم لە تاغووت وەرگرتن بە یەك چاو سەیر بکات وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لايعلمون﴾ يوسف (٤٠)، واتە حوکمڕانی بەس ئی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی -هیچ- مەپەرستن، ئا ئەوەیە دینداری ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. بەڵێ ئیسلامێکی وا چۆن دەگونجێ بەبێ هەبوونی کیان و قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆو ئازاد بەڕێوە ببرێ!!

## چوارەم:

ئەوەی گوتمان دەربارەی هەڵوێستمان لەمەڕ مافی چارەنووس و کیان و قەوارەی سیاسی شتێکی مەبدەئی بوو، بەڵام ئایا ئێمەی ئیسلامی لەگەڵ دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ یان کۆنفیدراڵی یان فیدراڵی داین؟! ئەوە هەر بەکورتی دەڵێین: لە ڕۆژگاری ئێستاماندا هیچ کام لەمانە لەگەڵ پرنسیپە گشتییەکان (المبادئ العامة)ی ئیسلامدا دژنارەستن و، ئەزموونی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامیش پشتگیرییان دەکات و نموونەش زۆرن، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرکام لەمانە هەر ناو نەبن و نێوەرۆکیشیان هەبێ، بەڵێ ئیسلام کە چەوساندنەوەی تاکە ئینسانێك حەرام دەکات و، هەموو جۆرە ستەمێکی شەخسی لەمەڕ ڕووێکەوە بێ بەبێ شەرعیو

ناڕەوا دەزانێ، دیارە چەوساندنەوەو پلیشاندنەوەی گەل و میللەتێکی سی چل (٣٠-٤٠) ملیۆنی وەك کورد -هەروەها هەر گەل و میللەتێکی دیکەش چ کەم بێ چ زۆر- حەوجار حەوجارو بە (طريق الأولى) ڕەد دەکاتەوەو لێزیشی دەوەستێ، کەواتە هەر جۆنێکی چەوساندنەوە (اضطهاد)ی ئینسانەکان و میللەتان چاکتر بنبڕ بکرێو ڕێی لێ بگیرێ، ئیسلام پشتیوانی لێ دەکات و ئامانجی کۆتایی (جیهاد)ش لە ئیسلامدا هەر نەهێشتنی چەوساندنەوەو جەورو ستەمی تاغووت[1] و ملهوڕانە وەك فەرموویەتی: ﴿وقاتلوهم حتى لاتكون فتنة ويكون الدين كله لله..﴾ الأنفال (٣٩)، وە فەرموویەتی ﴿وما لكم لاتقاتلون في سبيل الله

---

(١) (طاغوت) وەك توێژەرەوانی قورئان و زانایانی فەرهەنگەکانی زمان فەرموویانە: (كل معبود سوى الله) هەر پەرستراوێکە جگە لەخوا، بۆ وێنە پێشەوای توێژەرەوان (امام المفسرين) ابن جرير الطبري لەو بارەوە دەڵێ: (والصواب من القول عندي في (الطاغوت) انه كل ذي طغيان على الله، فعبد من دونه اما بقهر منه لمن عبده، واما بطاعة ممن عبده له، إنسانا كان ذلك المعبود او شيطاناً او وثناً او صنماً او كائناً من كان، وارى أصل الطاغوت من (الطغووت) من قول القائل: طغا فلان يطغو، اذا عدا قدره فتجاوز حده). بڕوانە: تەفسیری (الطبری) ب٣، ل٢١. واتە: وەتسەی ڕاست و تەواو لەلای من لە بارەی تاغووتەوە ئەوەیە کە تاغووت هەموو یاخی بووێکە لەخواو لەجیاتی خوا دەپەرسترێ جا بەهۆی تۆبزی کردنی بێ لەو کەسەی کە دەیپەرستێ، یاخود بەهۆی فەرمانبەری بۆکردنی بابای پەرستارەوە بێ، جا ئەو پەرستراوە ئینسان بێ، یان شەیتان بێ، یان دارو بەرد بێ، یان بت و صەنەم، یان هەر شتێکی دیکە، وەپێم وایە ڕیشەی تاغووت -لە ڕووی‌زمانەوە- لە (الطغووت)ە، کە یەکێك دەڵێ (طغا فلان يطغو) هەر کاتێك لە ڕاددەی خۆی چۆدەرێو لە سنووری خۆی دەرچوو.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! تاغووت هەر شتێکە کە بپەرسترێو ڕازیش بێ بەو پەرستنە، با ئەو پەرستنە لەبەشێك یان لەبوارێك لەبوارەکانی پەرستنیش دابێ، بۆ وێنە: هەر کەسێك لەڕووی خۆشویستن و دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الموالاة والمعاداة)یەوە بپەرسترێ ئەوە تاغووتە، وە ئەوەی لە بواری فەرمانبەریوشوێن کەوتن و بە حاکم دانرانەوە بپەرسترێ ئەوە (تاغووت)ە، وە ئەوەی لە ڕووی دووعاو لێ ترسان و پشت پێ‌بەستن ونەزرو قوربانی سەربڕینەوە بپەرسترێ بەهەمان شێوەو بەکورتی هەر کەسێك لەو ڕووەوە بپەرسترێ کە تایبەتمەندی‌یەکانی خوایەتی (خصائص الالوهية) هەموویان یان هەندێکیانی بۆ بڕیار بدرێ ئەوە (تاغووت)ە. بڕوانە: (الطاغوت) ی ئەبوو بەصیر، ل٧٠.

والمستضعفين...﴾ النساء (٧٥)، واتە: ئەوە چیتانە بۆچی لە پێناوی (ڕەزامەندیی) خواو (ڕزگاریی) چەوساواندا ناجەنگن؟! بەڵێ خوای پەروەردگار ئینسانەکانی بۆ بەندایەتی خۆی خوڵقاندووە نەك بۆ کۆیلایەتی یەکتر، مرۆڤایەتیشی بۆ چەندان تیرەو گەلی جیاجیا دابەش کردوە تاکو یەکتر بناسن و هاوکاری یەکتری بکەن وەدەستباری ژیان و گوزەرانێکی ڕاست و دروست بۆ یەکتر بگرن، نەك هەندێکیان هەندێکی تریان بکەنە دیل و ژێردەستەی خۆیان و بیان چەوسێننەوەو زەلیل و زەبوونیان بکەن، ئەوەتا خوای دادگەرو تۆڵەستێن دەربارەی فیرعەونی خۆبەخوازان و زۆردارو ملهوڕ فەرموویەتی ﴿إن فِرعَون عَلا في الأرض وَجَعَلَ أهلَها شِيَعاً يَستَضعِف طائِفَةً مِنهم يذبح أبناءهم وَيَستحي نِساءهُم إنه كان من المفسدين. ونريد أن نَمُن على الذين استُضعِفوا في الأرض وَنَجعَلَهُم أئمة ونجعلهم الوارثين﴾ القصص (٤-٥)، واتە: بەڕاستی فیرعەون لە زەوی (میصر)دا خۆی بەرزو فەڕز کردبوو و خەڵکی ئەویی بەش بەش کردبوو هەندێکیانی دەچەوساندنەوە؛ کوڕەکانیانی سەردەبڕیو ئافرەتەکانیشیانی بەزیندوویی دەهێشتەوە، بێگومان ئەو لە خراپەکاران بوو، بەڵام ئێمەش دەمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین کە لەزەویدا دەچەوسێنرێنەوەو بیانکەین بەپێشەواو بیانکەین بەمیراتگر -ی فیرعەونەکان-.

بەڵێ! چەوسێنرانەوەو چینایەتی -چ لەڕووی سیاسی چ ئابووری چ کۆمەڵایەتی- لە هەر شوێنێك هەبێ دیارە حوکم و دەسەڵاتێکی تاغووتیو فیرعەونی لەئارا دایە، جا بەهەر ناوێك و لەهەر بەرگ و بیچمێك دابێ، وە ئازادی ڕاستەقینەو دادگەری هەمەلایەنە تەنهاو تەنها لەژێر سایەی حوکمی بەرنامەی خوادا مەیسەر دەبێ، دیارە ڕەوانەکرانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و هاتنە خوارەوەی کتێب و بەرنامەکانی خواش هەر بۆ ئەمە بووە، وەك خوای دادگەرو بەخشەر فەرموویەتی ﴿ لقد أرسلنا رُسُلنا بالبَينات وَأنزلنا مَعَهُمُ الكِتاب والميزان لِيَقوم الناس بالقِسط...﴾ الحديد (٢٥)، واتە: بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوەو کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار تاکو خەڵك بەدادگەری بەڕێوە بچن...

## ١١- با لە کوردایەتی کردنمان دا وریا بین!

دەبێ زۆر وریابین و لەگەرمەی هەست و سۆزی نەتەوایەتی‌و هەست کردنمان بە ستەمدیدەیی (مظلومیة)ی گەلەکەماندا تووشی چوار (٤) هەڵەی کوشندە نەبین:

١- خۆ کورت هەڵێنان لە قاوغ و جوغزی تەسکی نەتەوەییماندلو گۆشەگیری‌و دابڕان لەگەلانی دیکەی نێو ئۆممەت و جیهانی ئیسلامی، چونکە ئەمە وێڕای ناشەرعی بوونی پێچەوانەی حاڵەتی شارستانەتی‌و ڕەوتی سیاسەتی پێکهێنانی قەوارەی فراوان و بەرەی هەمە جۆریشەو دەبێتە جۆرە خۆ خنکاندنێك.

٢- دژایەتی کردنی هەر کام لە گەل و نەتەوەکانی عارەب و تورك و فارس بە پاساوی ئەوەی کە ئەو سێ گەلە دراوسێ‌یە هەریەکە بەشێك لە کوردستانیان دابڕیوەو گەلی کوردیان بەسەردا بەشراوەتەوە، چونکە کورت بینی‌و ڕواڵەت بینی‌یە کە ئێمە بەرهەم و دەرئەنجامی (سایکس پیکۆ) ببینین، بەڵام بەرهەم هێنەرو ئەنجامدەرانی ئەو پەیمانە شوومە بەدی نەکەین، وە لەجیاتی ڕق داگرتن لەوانەی ئەسڵ و سەرچاوەی کێشەو دەردی ئێمەن، ڕق لەوانە هەڵگرین کە لە بەرانبەر سایکس پیکۆدا لەئێمە دەستەپاچەتر بوو ون، دیارە لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە ڕژێمە تورکی‌و عارەبی‌و فارسی‌یە داپڵۆسێنەرو دڕندەکان تاوانبار نەکەین، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ڕقی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی ئەو گەلانە بە خەڵك و جەماوەرەکەیان نەڕژێن و بەچاوی دوژمن سەیری ئەو گەلانە نەکەین بەبێ جیاوازی لەنێوان چاك و خراپیاندا، وە ڕق بوونەوەشمان لەو ڕژێمانە بێ ئاگامان نەکات لە ماك و سەرچاوەی دەردو کێشەو گرفتاری‌یەکانی ئێمەو ئەوانیش کە ئیمپریالیزمی جیهانی کۆن و تازەیە.

دیارە ئێمە وێڕای گلەیی‌مان لەڕژێمە داپڵۆسێنەرەکانی عارەب و تورك و فارس لە دوو حاڵەندا گلەییش ئاراستەی ئەو سێ گەلە دراوسێ‌یەمان دەکەین:

(ا) کە پشتگیری ڕژێمەکانیان بکەن و بۆیان ببنە سووتەمەنی لەشەڕی دژی کوردو داپڵۆسێنەرانەیاندا چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی ﴿..إن فِرعَون وَهامانَ وَجُنودَهُما كانوا خاطئين﴾ القصص (٨).

(ب) کە بەهاندەری ڕەگەزپەرستی‌و نەتەوەپەرستی ئەم حاڵەتە ناشەرعی‌و ناتاسایی‌یەی کە لەسایەی شوومی (سایکس پیکۆ)وە بەسەر جیهانی ئیسلامی‌دا بەگشتی‌و گەلی کورددا بە

تایبەت سەپێنراوە بە ڕەوا بزانن و، ئەو سنووروو دەوڵەتۆکە ئیمپریالیستی‌یانەی[1] هەیانن وەك ئێراق و تورکیاو ئێران و سوریاو میسرو جەزائر سعویەو... هتد. کە لەسەر کەوڵی ئوممەتی ئیسلامی‌و بەمەبەستی پارەپارە کردنی‌و زەلیل کردنی دروست کراون بەشتێکی پەسندو پیرۆز (مقدس) بزانن و هەر کە گەل کوردی مسوڵمانیش باسی کیان و بوونی خۆی کرد لێی بکەنە گاڵەو هەراو بە ئاژاوەچی‌و (إنفصالي)و چی‌وچی حیساب بکەن، هەر لەبەرئەوەی ئیمپریالیزماغا لە (سایکس پیکۆ) نامەکەی‌دا هیچ حیسابی بۆ گەلی کورد نەکردوە، ئەوانیش بەتەقلیدی ئیمپریالیزم و پابەندی بەپەیمان نامەیەکەوەو گوێ لەمستی بۆ بڕیارەکانی، هیچ حیسابی بۆ نەکەن و گوێی ئیمان و عەقڵ و ویژدان بۆ داوای ڕەواو، ئەو هەموو ئاهو ناڵەو دادو فیغانەی نەگرن کە دەگاتە کەمکەشانی فەلەك[2]!!

---

(۱) مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو دەوڵەتۆکانە بەپێی نەخشەو پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانی دروست کراون.

(۲) لەساڵی ۱۹۹٦ لە ئەستەمبوڵ، کە دەعوەت کرابووین بۆ بەشداری لە پێنجەمین کۆبوونەوەی ساڵانەی کۆمەڵ و بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکان کە هەموو ساڵێ حیزبی ڕەفاهی تورکیایی لەیادی ئازادکردنی (القسطنطينية)دا –کە ئێستا ئەستەمبوڵی پێ دەڵێن– سازی دەکات، برایەکی عارەبی میصری کە لە برایانی (اخوان المسلمين) بوو، بەسەرسووڕمانەوە سەرنجی یەخەی چاکەتەکەمی داو گوتی: ئەوە چی‌یە برام بۆچی لە پسولەکەت نووسراوە (The North of Iraq) (باکوری عێراق)؟! منیش گوتم بۆچی؟! چ ئیشکالێکی تێدایە؟! گوتی: مەگەر نازانی کە ئەوە بۆنی خۆجیاکردنەوە (الانفصالية)ی لێ دێ؟! منیش گوتم : با، ڕاست دەفەرمووی، منیش ئەم نووسینە بەزوڵم و ناشەرعی دەزانم! گوتی: کەواتە تۆش پشتگیریم دەکەی کە ئەم نووسینە هەڵەیە؟! گوتم بەڵێ، بەلاَم نەك بەو جۆرەی جەنابت! گوتی ئەی چۆن؟ گوتم: لەڕووی شەرعی‌یەوە هیچ کەسێك بۆی نیە زەوی یەکێکی‌ترو هیچ گەلێك بۆی نیە خاکی گەلێکی‌تر زەوت بکات و مەسەلەی (غصب)کردنی زەوی‌و زارو موڵك و ماڵی خەڵك لە قورئان و سوننەت و کتێبە شەرعی‌یەکاندا زۆر ئیدانە کراوەو بەکارێکی زوڵم و ناڕەوا دانراوە، جا باکوری عێراق –هەروەها ڕۆژهەلاَتی تورکیاو ڕۆژئاوای ئێران و بەشێکی سووریا– مادام خاکی میللەتی کوردەو کوردی لێ ژیاوەو لێ دەژی، شەرعی نیە بلکێنرێ بەکیان و قەوارەی گەلێکی دیکەوەو هەر ئەسڵەن ناوەکەیشی لەسەر نەخشەی سیاسی بسڕنەوە! بەڵکو دەبوایە لەسەر پسوولەکەی من نووسرابایە (بەشە کوردستانی لکێنراو بە عێراقەوە) (القسم الملحق بالعراق

مەگەر پابەندبوون و گوێ لە مست بوون بۆ نەخشەو پیلان و بڕیارەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی ڕاست بەراوەژوو و پێچەوانەی فەرمانی خوا نیە کە پێمان دەفەرموێ ﴿یاءیها الذین آمنوا إن تُطیعوا فَریقاً من الذین اوتوا الکتاب یردوکم بعد إیمانکم کافرین. وکیف تکفرون وانتم تتلی علیکم آیاتُ الله وَفیکم رسوله! ومن یعتصم بالله فقد هُدِيَ إلی صِراطٍ مُستَقیم﴾ آل عمران (١٠٠-١٠١)؟!!

وە ئایا پێچەوانەی فەرمانی خوا نیە کە بە پێغەمبەرﷺ -و ئۆممەتەکەیشی- دەفەرموێ ﴿ثم جعلناك علی شریعة من الأمر فاتبعها ولاتتبع اهواء الذین لایعلمون..﴾ الجاثیة (١٨)؟!!

٣- تێکەڵ کردنی سۆزی نەتەوایەتیو بیری نەتەوایەتی، یان مافی نەتەوایەتیو نەتەوەپەرستی، چونکە نەك هەر دووشتی لەیەك جیان بگرە ڕاست پێچەوانەو دژی یەکتریشن! ئاخر هەرچی سۆزی سروشتی نەتەوایەتیو نیشتیمان دۆستیە، ئەوەیە کە ئینسان گەل و نیشتیمانی خۆی لەسەر هەق خۆش بوێ و بەرگرییان لێبکات و نەمێڵێ هیچ کەس گەلەکەی بچەوسێنێتەوەو نیشتیمانەکەی لێ زەوت بکات، بەڵام بیری نەتەوایەتی (ناسیۆنالیزم)و نەتەوەپەرستی ئەوەیە کە گەل و نیشتیمانی خۆت لەسەر ناهەق خۆش بوێو هەوڵ بدەی هەموو گەل و نیشتیمانێکی دیکەیان بەقوربان و بەلاگێڕەوە بکەی، بەواتایەکی دی سۆزی نەتەوایەتیو نیشتیمان پەروەری ئەوەیە کە بڵێی با گەل و نیشیمانیمنیش وەك گەل و نیشتیمانەکانی دیکەی دنیا ڕزگارو ئازاد بن، بەڵام ناسیۆنالیزم دەڵێ دەبێ گەل و وڵاتی من ئاغاو کوێخا بن وخەڵکی تریش خزمەتکارو ژێردەست، مەگەر هەرکام لە هیتلەرو مۆسۆلینیو ڕەزا شاو کەمال ئەتاتورك و صەددام حوسێن هەر وایان نەدەگوت و واشیان نەکرد؟!

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە، سەرچاوەی هەڵقوڵینی سۆزی نەتەوایەتیو داواکردنی مافی نەتەوایەتی فرچك و وسروشتی پاکی ئینسانە -هەر بۆیەش شەرع بەڕەوای دادەنێو پشتگیری دەکات- بەڵام کانگای بیری نەتەوایەتیو شوێنی تێدا سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم - وەك لەباسەکانی ڕابردوودا گوتمان- کۆمەڵگا ڕۆژئاوایییەکانن کە لەئەنجامی لەبەرچاو بێزرانی ئایین و بەها بەرزەکانی بەهۆی هەڵس و کەوتی چەوت و زاڵمانەی دامو دەزگاکانی کڵێساوە

---

من کردستان)!! دیارە ئەو برایە ئەوەی گوتم بۆی هەزم نەکرا، بەڵام خوا هەقە دەمیشی بوو بەتەڵەی تەقیوو هیچی پێ نەگوترا، مەگەر نالێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ)!!

هەستیان بەبۆشایی عەقیدەیی و فیکری و ڕووحی کردو بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشایییەش پەنایان بۆ کۆمەڵێك ڕێچکەو بیردۆزە برد کە یەکێکیان بیری ناسیۆنالیزم بوو.

٤- با بەمەرەدی عارەب و تورك نەچین! کەدەبینین هەر کام لەگەڵ عارەب و تورك -کە جاران لەسایەی ئیسلامدا برا گەورەو سەرقافڵەی کاروان بوون- لەئەنجامی پەنا بردنیان بۆ ڕێچکەو بیردۆزە ڕۆژئاواییەکان ئێستا بوونەتە پاشکۆیەکی زەلیل و بەهیچ دانراوی ڕۆژئاوا، جاران بەهۆی ئیسلامەتییەوە چەندە گەورەو بڵند بوون ئێستا بەهۆی عەلمانیەت و ڕوو لەخوا وەرگێڕانەوە هێندە گچکەو نابووتن! جا با ئێمەی گەلی کوردی مسوڵمانیش دەرس و پەند لەو دوو گەلە مسوڵمانە پێ بەپشکۆ سووتاوە وەربگرین و ئەوەی ئەوان دەستیان پێیەوە چزاوە ئێمەش دەستمان پێیەوە نەچزێ، چونکە ئینسان جاری وا هەیە بۆ خۆی تازە لە سەرەتای ڕێیەکدا هەنگاو دەنێ و نازانێ کۆتایییەکەی چییەو چۆنەو بەکوێ دەگات، بەڵام ئەگەر لەو کەسانە پرسیار بکات کە تا کۆتایی ڕۆیشتوون و گەڕانەوە تێ دەگات کە ئایا درێژە بە ڕێگا بڕینەکەی بدات یان وازی لێبێنێ و ڕێیەکی تر بگرێتە بەر!

بەئومێدی ئەوەی گەلەکەمان بەهۆی پەند وەرگرتن لەغەیری خۆی و لە خۆیشی بەختەوەر بێت.



# لە کۆتایی دا

خوێنەرانی بەڕێز!

ئەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەدا هاتوە -لەگۆشەنیگای بەندەوە- هەڵوێستی ئیسلامە لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتی بەگشتی -و ناسك ترین و دژوارترین کێشەی نەتەوایەتی لەسەدەی بیست دا کە کێشەی کوردە بە تایبەت-، جا هیوادارم ئەم نووسراوە بەرچاو ڕوونکەرەوەی ئیسلامی یەکان بێ، بۆ برادەرانی لائیك و ناسیۆنالیستیش ئیقناع کەرو دڵ دامرکێنەر بێ، چی دی بەناهەق ئیسلام و ئیسلامی یەکان تۆمەتبار نەکەن و لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشایان نەکەن! ئەمە وەك حاڵەتی تیۆری (نظری) ئیسلامی یەکان لەمەڕ مەسەلەی نەتەوایەتی و کوردایەتی، وەك هەڵوێستی کردەیی (عملي)و حاڵەتی (تطبيقي)یش (کە وەك لەپێشەکی ئەم چاپی دووەمەدا ئاماژەمان کرد لێك ترازانی قسەو کردەوەو حاڵی بوون و حاڵی ئیستان نەخۆشی یەکی زۆر خراپە) پێمان وایە ئیسلامی یەکان ئەگەر لە قەدەر ئیسلامیش نەبن (کە بێگومان ئەمەش کەم و کوڕی و کرچ و کاڵی یە)، بەڵام لەقەدەر بارودۆخی سەخت و دژواری کوردستان و لەچاو خەڵکی دیکە کە کوردو کوردستانیش ویردی سەر زمانیانە حاڵیان چاك و پەرێزیان پاکە.

خوای دادگەرو میهرەبانیش بەلوتفی خۆی دەرووی خێری چاکتر لەگەڵ مسوڵمانی کوردو گەلانی دیکەی مسوڵمانیش بکاتەوە، هیدایەتیان بدات کەجارێکی دیکەش هەموویان لەژێر یەك ئاڵاو لەیەك قەوارەدا کۆ ببنەوە، بۆ ئەوەی لەئەنجامی کۆبوونەوەی مسوڵمانان لەیەك بازنەی عەقیدەیی و یەك قەوارەی سیاسی دا، چەمك و واتای ڕاستەقینەی ئوممەتی پێغەمبەرﷺ زیندوو بێتەوە، نەك هەر ئوممەتی ئیسلام بەڵکو سەرجەم مرۆڤایەتی بەهەموو ڕەنگ و ڕەگەزو زمان و بیروباوەڕەکانی یەوە لەسێبەری فەرمانڕەوایەتی دادگەرانەی ئیسلامدا بەختەوەر بێ و بحەسێتەوە.



# ناوەرۆک

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

